منتدى إقرأ الثقافي
للكتب ( كوردى - عربي - فارسي )
www.iqra.ahlamontada.com

# مێژووی دەوڵەتی ئەیوبی کورد

## باسی سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبی
## لە سەرەتاوە تــــا کۆتایی

لە نووسینی
مەلا خالید فریزی

2005

# مێژووی دەوڵەتی ئەیوبی کورد

## باسی سوڵتان سەلاحەددینی ئەیوبی

## لەسەرەتاوە تـــا کۆتایی

لەنووسـینی

**مەلا خالید فریزی**

٢٠٠٥ی زایینی

ناوی کتێب : مێژووی دەوڵەتی ئەیوبی کورد
نووسەر : مەلا خالید فریزی
تیراژ : ۱۰۰۰ دانە
چاپی یەکەم
کۆمپیوتەر : جمیل سید قادر ( نووسینگەی بێخاڵ - هەولێر )
ژمارەی سپاردن : ۱۹٤ - هەولێر
چاپخانەی : بژار - هەولێر
ساڵی : ۲۰۰٥

بسم الله الرحمن الرحيم

**پێشەکی :**

لەپاش سوپاسی خودای مەزن و ناردنی درووود بۆ سەرگیانی پیرۆزی پێغەمبەر و یاران و هاوڕێیان و پەیڕەوانی ، ئەمە پوختەیەکە لە مێژووی دەوڵەتی ئەیوبی بەڕاستی نووسینی ژیاننامەی ئەو پاڵەوانە موسڵمانە کوردە شتێکی پێویستە و جێگای خۆیەتی کە هەموو کوردێکی خاوەن بیر و هۆش ئەو قارەمانە ئیمان قەیم و خۆڕاگرو نەترس و سەربڵند و دین دۆست و کافر بەزێنە بناسێ ، سوڵتان صلاح الدین هەرچەندە وەك سەرکردەیەکی موجاهید لە ڕێگەی خواو بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە خەباتی کردوە و تێکۆشاوە و جەنگاوە ، هەموو خەبات و تێکۆشانی ئەو قارەمانە نەبەزە هەر بۆ ئەوە بوو ، کە بتوانێ هەموو موسڵمانانی جیهان لە پەرتەوازەیی ڕزگار بکاو کۆیان بکاتەوە لە ژێر ئالای بەرزی ئیسلام ، وەئەم کارەشی کە ئەکرد نەبۆ پارە بوو نە بۆ کورسی بوو ، تەنیا بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە بوو ، هەرچەندە زۆر کتێب و نامیلکە سەبارەت بە دەورو ژیاننامەی ئەو قارەمانە نووسراون بەلاّم منیش بە پێویستم زانی کە بەکورتی باسی دەوڵەتی ئەیوبی و بنەچەکەی بنەماڵەی سوڵتان صلاح الدینی ئەیوبی کورد بنووسم لە سەرەتاوە تا کۆتایی بەڵکو بەهۆی خۆشەویستی ئەو قارەمانە دین دۆست و ئیمان قەیمە لەسەر حەوزی کەوسەر لە خزمەت پێغەمبەر (ص) چاومان بەو بەڕێزە بکەوێ چونکە بەڕاستی ئەم زانایە گەورە و دین دۆستە ئەم شۆڕە سوارە نەبەزە هەر لە

بەهاری ژیانی‌یەوە تـا وەفـاتی بـەردەوام هـەوڵی داوە و جـەنگاوە لـەپێناو پاراستنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام و موسڵمانان وە لـە پێنـاو یـەك گرتـن و کۆکردنەوەی موسڵمانان لەژێر ئالاّی بەرزی ئیسلام .

بسم الله الرحمن الرحيم

## باسی بنەچەکەی بنەماڵەی ئەیوبی

پوختەیەك لە میژووی دەوڵەتی ئەیوبی کورد و سوڵتان صلاح الدینی ئـەیوبی ئـەم دەوڵەتـە هەرەگـەورەی ئـەو حکومـەتانەیـە کـە کـورد دای مـەزراندوە ، لەبەر ئەمە زۆر پێویستە کە بـاش لـە ئەسـڵ و فەسـڵی تـێ بگەین ئینسقلۆپەدیای ئیسلام ئەڵێ ، باپیری صـلاح الدیـن نـاوی شـادی کوڕی مـەروانە ، کەلە کوردانی خێڵی روادی رەوەندی دوین بوو ئـەم هـۆزە بەشێکی عێلە گەورەکەی ئەزبـەنی بـوو دویـن ، کـاتی خـۆی پایتـەختی حکومـەتی شەدادی کورد بوو بەلاّم ئێستا وێرانە ، دوین کەوتۆتە سنووری ناحیەی مـەسـیف صـلاح الدیـن ، ووشـەی دویـن ووشـەیەکی کوردیـە و مـەعـناکەشی قسەکردن یا پرسینە .

کوڕانـی شـادی ئـەیوب و شـێرکۆ لـە گونـدی ئـەجدنکان هاتۆتـە دونیاوە ، ئێستاش گوندێك بەناوی قەلاّتەجن هەرماوە لە نزیك دوین .

خاوەنی النوادر السلطانية کە قازی ابن شدادە وە راوێژکاری سـوڵتان صلاح الدین بوو ئەڵێ نجم الدین ئەیوب خـەڵکی دوینـە و ، والی تکریـت بوو ل٤- حياة صلاح الدين الايوبي - ل٥٧ .

لەسەرچاوێکی تر ئەڵێ نجم الدین ئەیوب لە گوندی شێخان هاتۆتە دنیاوە ، ئێستاش گوندێك بەناوی شێخان لە نزیك دوین لە سنووری ناحیەی مەسیف صلاح الدین هەرماوە . الحروب الصلیبیة ل١١٢ .

ئینسقلۆپەدیای ئیسلام ئەڵێ : شادی باپیری سوڵتان صلاح الدین لەگەڵ بەهرۆزی ڕۆمی دۆستایەتی هەبوو ئەم بەهرۆزە مامۆستای کوڕی سەلجوقیەکان بوو ، لەپڕێکدا بەهرۆز دوینی بەجێ هێشت و چوە بەغدا ، وە بەهێز و زانستی خۆی پێشکەوت و لە تەرەف سوڵتان مەسعودی کوڕی مەلیکشاوە کرا بە موحافظی بەغدا ، لە دوای ئەمە خەبەری بۆ شادی نارد و بانگی کردەلای خۆی ، شادی بەماڵەوە چوە بەغدا ، لەدوای بەینێك سوڵتان مەسعود تکریتی بە مولکانە دا بە بەهرۆز و ئەویش شادی دۆستی خۆی لەجێگەی خۆی ناردە تکریت و پاش چەند ساڵێك شادی وەفاتی کرد و لە تکریت نێژرا . وە نجم الدین ئەیوبی کوڕە گەورەی لەجێگەی باوکی کرا بە والی تکریت .

لەساڵی ٥٢٦ك دا ، ئەتابەگی موصل عیماد الدین زەنگی لە باشووری تکریت لەگەڵ ئۆردووی سەلجوقی بەغدا شەڕی کرد و شکاو بەحاڵێکی خراپ خۆی گەیاندە تکریت نجم الدین ئەیوب میوانداری خۆی و لەشکرەکەی کرد و بەلەمی بۆ پەیاکرد و لەشەتی دیجلەی پەڕاندەوە . حکومەتی بەغدا لەم یارمەتی دانەی نجم الدین ئەیوب عادز بوو .

دوای ئەمە ڕووداوێکی تریش قەوما ئەسەد الدین شێرکۆی برای نجم الدین ئەیوب یەکێ لە ئەفسەرانی قەلای تکریتی کوشت و بەم جۆرە

جێگەیان لەق بوو ، وە بەهرۆز نجم الدین ئەیوبی لەوەکیلی خست و گوتی لە تکریت نەمێنن . نجم الدین ئەیوب بەناچاری لەگەڵ براکەی بەشەو تکریتی بەجێ هێشت و چوە موسڵ لای عیماد الدین زەنگی ، لە سالی ٥٣٢ك .

بەگوێرەی قسەی کاتبێکی گاور کەلە خزمەت نجم الدین ئەیوب بوو ، ئەو شەوەی کەلە تکریت دەرچوون صلاح الدین لەم شەوەدا لەدایك بووە . کاتێ نجم الدین و شێرکۆی برای گەیشتنە موسڵ عیماد الدین زەنگی چاکەی ئەیوبی هێنایە بەرچاوی و بەڕووخۆشی قبوڵی کردن ، کاتێك عیماد الدین چوە سەر سوریا و شاری بەعلەبەکی داگیرکرد ٥٣٤ك نجم الدین ئەیوبی کرد بە محافظی ئەوێ ، لەدوای وەفاتی عیماد الدین مولکەکەی کەوتە دەست کوڕەکانی ، لەشکری شام هاتنە سەر شاری بەعلەبەك نجم الدین ئەیوب زانی لەو پاشاگەردانیە دا ، لەشکری شام هەرچۆنێ بێ ، بەعلەبەك زەوت ئەکا بەفیکرێکی دووربین ، لەگەڵیان ڕێك کەوت و چوە شام دانیشت و بەرە بەرە پێشکەوت ، تا بوە سەرداری لەشکری شام ، شێرکۆی برای کەلەلای نور الدین مەحمودی کوڕی عیماد الدین زەنگی مابۆوە ، ئەویش بەخزمەت و ئازایی و عەقڵی خۆی پێشکەوت و بوو بە سەر لەشکری نور الدین زەنگی .

نجم الدین ئەیوب کاتێك کە خاچ پەرستەکان دەورەی شام یان گەمارۆدا ، مودافەعەیەکی مەردانە و بەرزی کرد و لەشکری خاچ پەرست شکاو لە شام دوور کەوتەوە ، ئەمیری شام هەرچەندە تابیعیەتی نور الدین

مەحمودی قبوڵ کرد بوو ، بەلاّم سولّتان نور الدین وەکو بـاوکی هـەرچاوی لەشام بوو ، وە بەفیکری داگیرکردنی لە ئیـدارەی شـێرکۆ دا ، لـە سـاڵی ٥٤٧ك دا لەشکرێکی ناردە سەر شام ئەم حاڵە نجم الدیـن ئـەیوبی خسـتە دوودڵیەوە چونکە حەزی نەئەکرد بەرامبەر برای خۆی بوەستێ و حەزیشـی نەئەکرد لەگەڵ لەشکری کوڕی دۆستی خۆی شەڕبکا ، بـەم فیکـرە باشـە ویستی ئیشەکە بە ئاشتی بیرێتـەوە ، لەگـەڵ شـێرکۆ دا بـەرەسمی کەوتـە گفتوگۆ لە دوای شەش ڕۆژ لەشکری شێرکۆ داخیلی شام بوو .

## ئەمیر صلاح الدین چۆن پێگەیشت

صلاح الدین بەعزێ ساڵانی منداڵی لە شاری بەعلەبەك دا ڕابـوارد ، لە حوجرەدا قورئانی‌پیرۆزی خوێنـدوە و فـێری خوێنـدن و نووسـین بـوە و ، کتێبی سەرف و نەحوی تەواو خوێندوە و شیعر و ئینشا و عیلمی حـەدیس فێر بوە و ، عیلمی حەدیسی لەلای حافظ ئەبو طاهـر السـلفی ، و ئـەبو طاهیر بن عوف و ، شێخ قطب الدیـن ی نیشـاپووری و عبـدالله بـن بـری النحوی خوێندوە ، قورئان و مەتنەکانی فیقهی لەگەڵ هـەندێك داسـتانی بەسوود لەبەر بوو ، لەڕووی زانستەوە زانایەکی بەتوانا بوو .

هەروەها لەڕووی سـەربازیەوە زۆر شـارەزاو خۆڕاگـر و نـەترس بـوو ، گەنجێکی عاقڵ و بەڕێز بوو ، لەڕووی ئایینیەوە زۆر بەدین بوو ، سوارێکی چاك بوو یاری گۆ و گۆچانی ئەکرد ، زۆر جاران ئەم یاریەی لەگەڵ سولّتان نور الدین دا ئەکرد ، ڕاووشکاریشی ئەکرد ، دەوامی مەجلیسـی سـولّتان نورەالدینی ئەکرد ، وەلەگەڵ باوکی و مامی لە هەموو غەزایەکدا ، حـازر

بوو ، دوای ئەمە کە سولّتان نور الدین زەنگی دەستی بەسەر شاری دیمەشق دا گرت و پایتەختی خۆی لە شاری حەلەب گواستەوە بۆ دیمەشق ، بەبڕیاری سولّتان نور الدین .

صلاح الدین کرا بە سەرۆکی پۆلیس لە دیمەشق وە بە جوانترین شێوە ئەم کارەی بەڕێوە برد و ، توانی لەماوەیەکی کەمدا دیمەشق پاك بکاتەوە لە گێرە شێوێنی و دزی و خراپەکاری ، توانی هێمنی و ئاسایش لەسەر تاسەری ولاّتی شام بگێڕێتەوە و ، خەڵك لەماڵ و گیانی خۆیان ئەمین بوون و ، داوای تەمەن درێژییان بۆ کرد .

## یەکەم سەفەری بۆ میسر

کەشاوری وەزیری خەلیفەی میسر ، داوای هێزی لە سولّتان نور الدین کرد ، سولّتان شێرکۆی بەلەشکرێکەوە نارد بۆ میسر ٥٦٢ك و ئەمیر صلاح الدین یش بە فەرمانی مامی لەگەڵ ئەم لەشکرە دا چوو وە بەرپرسی فیرقەی بەێشدار بوو ، ئەسەد الدین شێرکۆ هەرچی ئەی کرد بەپرس و ڕای صلاح الدین ئەی کرد ، چونکە زۆر لە ڕاوو تەدبیری ئەمین بوو . شێرکۆ کە گەیشتە میسر ، لەشکری ضرغامی لە شاری بلبیس دا شکاند و ئەم وەزیرەی لە قاهیرە دا موحاسەرە کرد ، وە لە دوای فستات قاهیرەش دەست شاور کەوت و ضرغام کوژرا و ، لەگەڵ ئەمەشدا شاوری وەزیری خائن ڕێگەی بە شێرکۆنەدا بچێتە ناو قاهیرە ، لەسەر ئەمە شێرکۆ صلاح الدینی بەلەشکرێکەوە نارد بلبیس و شەرقیەی زەوت کرد ، شاور کەوایزانی خەبەری بۆ ئەمەلریکی قەڕاڵی قودس نارد و داوای

یارمەتی لێ کرد و لەسەر ئەمە لەشکرێکی بەقوەتی ناردە سەر میسر ، شێرکۆ و صلاح الدین یش ، بلبیس یان بەرامبەر بە لەشکری قودس و میسر ، ، شێرانە سێ مانگ مودافەعەکرد و ، لەلایەکی تریشەوە سوڵتان نور الدین چوە سەر ولاتی قودس و قەلای بنباس ی موحاسەرەکرد ، قەراڵی قودس کە ئەمەی بیست ترسی لێ نیشت و لەگەڵ شێرکۆ رێك کەوت و بڕیاریان دا ، کە لەشکری شام و قودس ، لە خاکی میسر بچنە دەرەوە ، لەسەر ئەم بڕیارە شێرکۆ بەلەشکرەوە گەڕایەوە بۆ شام . لەدوای گەڕانەوەی شێرکۆ ، شاوری فێلباز لەگەڵ قەراڵی قودس رێك کەوت لەشکرێکی بچوکی قودس ی لە میسر دانا ئەمە بە تەبیعەت پێچەوانەی رێك کەوتنەکە بوو ، بۆیە سوڵتان نور الدین زەنگی لەگەڵ شێرکۆدا بڕیاری گرتنی میسر یان داو خەلیفەی عەباسی بەغداش بەمەرازی بوو ئینسقلۆپەدیای ئیسلام ٥٦٠ك .

## دووەم سەفەری میسر

لەدوای سەفەری یەکەم بەسێ ساڵ شێرکۆ بەخۆی و ئەمیر صلاح الدین و لەشکرێکی دوو هەزار کەسی هەڵبژاردەوە و ڕووی کردە میسر ، وەلە دوای زەحمەتێکی زۆر گەیشتە ئەتفەج ، کەچل میلێك لە قاهیرەوە دوور بوو لەوێشەوە خۆی گەیاندە جیزە ، لەشکری مەلیکی قودس یش لەبەرامبەر و لە قەراغی چەمی نیل بوو مەلیك ئاموری تفاقنامەیەکی لەگەڵ خەلیفەی فاتیمی میسر ئیمزا کرد و بەگوێرەی ئەم تفاقنامە میسر کەوتە ژێر حیمایەی مەلیکی قودسەوە لەدوای ئەم تفاقنامەیە مەلیکی

قودس بەخۆی و لەشکریەوە لە نیل پەڕیەوە ، شێرکۆ کە ئەمەی چاوپێ کەوت چوو بۆ سەعید و لەشکریقودس سەیری کرد ، شێرکۆ لە بابین ، ڕاوەستاوە کە لەشکری قودس نزیکی بۆوە ، شێرکۆ پەلاماری دان لەشکری قودس زۆر خراپ شکا ، دوای ئەمە شێرکۆ شاری ئەسکەندەریەشی زەوت کرد و ئەم قەلاّ گەورەیەی دایە دەست صلاح الدین ئەمە یەکەم حاکمیەتی صلاح الدین بوو ، دوای ئەمە شێرکۆنیوەی لەشکرەکەی بۆ ئەمیر صلاح الدین بەجێ هێشت و خۆشی لەگەڵ نیوەکەی تر چوو بۆ سەعید .

مەلیکی قودس لە دوای شکانی گەڕایەوە قاهیرە و لەگەڵ مەلیکی حکومەتی میسردا ، بڕیاریان دا ئەسکەندەریە بگرن ، لەتەرەف بەحر و بەڕەوە دەوریان گرت ئەمیر صلاح الدین قەهرەمانانە مودافەعەی کرد ، حەفتا ڕۆژ بەم جۆرە بەرامبەر هێرشی بەحر و بەر وەکو شێر وەستا ، لەولاشەوە شێرکۆ ڕووی کردە پایتەختی میسر و موحاسەری کرد ئەم دەست و بردەی شێرکۆ دوژمنی ترساند ، ناچار داوای ئاشتیان کرد .

بڕیاریان دا کەلەشکری قودس و شام میسر بەجێ بهێڵن و بەگوێرەی ئەم تفاقە هەردوو لەشکر لە میسر چوونە دەرەوە ، شێرکۆ و صلاح الدین گەڕانەوە بۆ شام .

خیلافی سوڵح ئەوەندەی پێ نەچوو کە قەڕاڵی قودس بۆ داگیر کردنی میسر بەلەشکرێکەوە ڕووی کردە میسر شاری بلبیسی گرت و کوشتارێکیزۆری لە خەڵکی میسر کرد و منداڵ و ژنیش لەم کوشتارە ڕزگار نەبوو .

ئەم جارە خەلیفەی فاتیمی بەنەفسی خۆی کەوتە هاوار و کاغەزێکی بۆ سوڵتان نورالدین زەنگی کورد نووسی و تکاو داوای هێزی لێ کرد و پرچی ژنی موسڵمانی بۆ نارد و ئەمەش نیشانەی پاڕانەوەیەکی لەڕادە بەدەر بوو .

## سێیەم سەفەری میسر

سوڵتان نور الدین لەسەر پاڕانەوەی خەلیفە بڕیاری خۆی دا لەشکرێکی بەقوەتی کۆکردەوە و بەسەرکردایەتی شێرکۆ ناردی بۆ میسر ، ئەم لەشکرە هەشت هەزار کەسێك بوو ، وە گەڵی سەرکردەی دیار و ناسراوی تیابوو ، صلاح الدین ئارەزووی چوونی نەبوو بەلاّم بەرامبەر بە ئەمری سوڵتان و مامی نەیتوانی ڕاوەستێ و لەگەڵ مامی چوو ، مەلیکی قودس کە خەبەری هاتنی شێرکۆی بیست ترسا و یەکەم جار ویستی نەهێڵێ بگاتە میسر بەلاّم پیێ نەکراو لەئەنجام بەناچاری گەڕایەوە قودس.

لەولاشەوە شێرکۆ گەیشتە میسر و لە بەردەم قاهیرە وە خەلیفەو خەڵکی میسر پێشوازیەکی شاهانەیان لێ کرد و لەبەردەمی قاهیرە دا خێوەتی هەڵ دا ، شاوری وەزیریش فیکری وا بوو کە زیافەتێك بۆ شێرکۆ و ئومەرای شام بکاو هەموویان لەناو بەرێ بەلاّم کاملی کوڕی بەم خیانەتە ڕازی نەبوو ، لەگەڵ ئەمەشدا بۆ خیانەت لە فرسەت ئەگەڕا تا ڕۆژێکی جومعە بەناوی سەردان چووە ئۆردووی شێرکۆ بەلاّم شێرکۆ لەوێ نەبوو ، صلاح الدین لەگەڵ هەندێ سەرکردەی تر لەگەڵ شاوری خائن چوون بۆ

دەرەوەی ئۆردوو لەوێ قۆڵیان بەست و بۆلای خەلیفەیان نارد لە ئەنجام شاوری وەزیر بەبڕیاری خەلیفە کوژرا .

لەدوای ئەمە خەلیفە عاضد ئەسد الدین شێرکۆی کرد بە وەزیر و لەقەبی ، مەلیك المنصور ئەمیر و لجیوش ی ، دایە بەلاّم وەزارەتی ئەوەندە دەوامی نەکرد و لە ڕۆژی ٢٢ی مانگی جماد الاخر ٥٦٤ك دا ، وەفاتی کرد .

## وەزارەتی ئەمیر صلاح الدین

ئەمیر لە دوای سێ ڕۆژ تەعزیە، فەرمانی خەلیفە بۆ وەزارەتی ، دەرچوو هەندەك لە ئومەرای شام بەم بڕیارە خۆشحال نەبوون و گەرانەوە بۆشام ئەمەش نیشانەی حەسوودی بوو ، ئەگەر نا بۆ ئەو مەقامە ، هیچیان بەقەد ئەمیر صلاح الدین لایەق نەبوون ، خەلیفە لەقەبی ملك الناصر ابو المظفر صلاح الدنیا والدین یوسف بن ئەیوب ی دایە، ملك صلاح الدین لەتەمەنی بیست و دوو ساڵیدا وە لە دوای تەکامولێکی سیاسی و عەسکەری ، گەیشتە ئەم مەقامە، بەلاّم کە تەماشای ئەترافی خۆی کرد ، کەسی وای لە ئومەرا نەدی ، کە بە گیان و دڵ یارمەتی بداو ، وای بە باش زانی کە باوك و برایەکانی و خزمەکانی لە خۆی کۆ بکاتەوە ، کاغەزی بۆ نووسین و هاتن کە باوکی هات خەلاّتی وەزارەتی لەسەر شانی خۆی هەڵگرت و پێشکەشی باوکی کرد ، بەلام باوکی قەبووڵی نەکرد و گووتی : ئەگەر تۆ لایەق نەبویتایە ، خوا ئەمەی نەئەدایتێ ، صلاح الدین ویستی خەڵکی میصر لە خۆی رازی بکاو زۆر چاکەی لەگەڵ کردن ، هەرچەندەخۆی سونی بوو و خەڵکی میصر شیعە

بوون ، هیچ دەخلی ئیشوکاری مەزهەبی نەکردن و تەنیا لە خوتبەدا لە دوای ناوی خەلیفەی ناوی سولّتان نورالدین زەنگیش ئەبرا .

لەکاتی وەزارەتی دا خاچ پەرستەکان ، شاری دمیاتیان داگیر کرد صلاح الدین شارەکەی وەرگرتەوەو لە میسر دەری کردن و جگە لەمە شاری عەقەبەش کە لەسەر ڕێگەی حەجاجی میسر بوو سەندەوە ، بەهۆی ئەمە مەوقیعی صلاح الدین ڕۆژ بەڕۆژ لە دڵی خەڵکی میسرو ئومەرای دا لە بڵندیدا بوو .

کاتێك مؤتمن الخلافة ، کەوتە خیانەتەوە لەگەڵی وە هەتا فەرەنگی لێ هان دا کە بێنە سەر میسر تا صلاح الدین بکەوێتە بەینی دوژمنی دەرەوە و ناوەوە مؤتمن الخلافة بەلەشکری سودان ، کە پەنجا هەزار کەسێك بوو ، پشت ئەستوور بوو صلاح الدین لە فرسەتێکدا ، ئەم خائینەی لەناو برد ، لەسەر ئەمە لەشکری سۆدانی دەستیان کرد بە ئاژاوە نانەوە .

صلاح الدین ، شەمس الدولە تورانشا ی برای خۆی خستە کار بۆ کوژاندنەوەی ئەم ئاگرە ، بەڕاستی ئەم برا ئازاو دڵسۆزە باش لە عۆدەیان هات و لە ماوەی دووسێ ساڵ ڕەچەڵەکی بڕینەوە ، لە خاکی میسردا سۆدانی نەهێشت و زۆری کوشتن ، هەندێکیشیان رایان کرد بۆ سودان ، لەوێش لەتەرەف عادل شای برایەوە تەفرو تونا کران .

لە دوای کوشتنی مؤتمن الخلافة جەوهەر ، ئەمیر صلاح الدین بهاء الدین قرەقوش ی کرد بە مؤتمن الخلافة ، ئەمیر صلاح الدین هێشتا تازە هەرای سۆدانی بڕیبۆوە کە خاچ پەرستەکان هاتنە سەر شاری دمیات

مەلیکی قودس لە گەڵ حکومەتی رۆم دا قسەی کرد بەیەك و، ویستی میسر داگیر بکاو لەپێش هاتنی لەشکر و دوننمای ڕۆمدا خۆی هاتە سەر شاری دمیات و بۆ مودافەعە حازر بوو لەبەر ئەوە دوننماو لەشکری قودس لەدوای پەنجا ڕۆژ شەڕو موحاسەرە بە حاڵێکی خراپ گەڕانەوە و هیچیان پێ نەکراجگە لەمەش بە تەقدیری خوا فەرتەنەیەکیش لە بەحردا پەیدا بوو پاشماوەی دوننمای ڕۆمی غەرق کرد .

صلاح الدین لەگەڵ ئەمەدا کە وەزیری خەلیفە عاضد بوو لەتەڕەف سوڵتان نور الدین زەنگی یشەوە مەنسەبی سپاسالاری بوو .

صلاح الدین لەدوای ئەم سەرکەوتنە یەك لە دوای یەکە ڕۆژ بە ڕۆژ پلەو پایەی لە بلندی دابوو وە لە دوای پاکسازی ناوەوە و سەرکەوتن بەسەر خاچ پەرستەکاندا ویستی بۆ تەئمینی سەر بەخۆیی وردە وردە مەزهەبی سوننی لەبەینی میسریەکان بلاو بکاتەوە بەم فیکرە باشە دوو مەدرەسە حوجرەی گەورەی کردەوە یەکێکیان ناسریە و ئەوی تریشیان کاملیەی ناونرا ، ابن اسیر ئەڵێ مەدرەسەیەکی بۆ مەزهەبی شافعی لە قاهیرە دروست کرد و قازیانی شیعەی میسریشی عەزل کرد لە جێگەی ئەوان قازی شافعی دانا .

دوای ئەمە خەلیفە عاضد وەفاتی کردلە ٥٦٧ك دا، صلاح الدین خەزێنەی قەسری خەلافەتی بەسەر ئومەراو پیاو ماقوڵان و هەژاران دابەش کرد .

# مەلیك صلاح الدین

لەدوای وەفاتی خەلیفە عاضدي فاتمی شیعە صـــلاح الدیـن بـوو بـە مـەلیك و حكومداری سەربەخۆی میسر یەكەم ئیشی دروستكردنی قـــەڵای قاهیرە بوو دیوارێكی مەحكەمی بەدەوری شاری قاهیرە دا دروســـت كـرد و قەڵایەكیشی بەناوی خۆیەوە بۆ پاراستنی شارەكە بینا كرد وە لە نـــاو ئـەم قەڵایەشدا سەراو دەوائیر و هەندێك خانووی موناسیبی بۆ خۆیی و دەست و پێوەندی دروست كرد ، وە نیشانەی بـــەیداخی سـوڵتان صـلاح الدیـن كـە هەڵۆ یەكی سوور لەسەر زەمینێكی زەرد بوو ئیستاكەش بەسەر یەكێ لـە دیوارەكانی قەڵاكەوە ماوە .

مـەلیك صلاح الدین نەی ویست كە سوڵتان نور الدیـن زەنگـی لێـی بكەوێتە گومانەوە لەبەر ئەمە لە خوتبەی جومعە لە دوای ناوی خەلیفەی عەبباسی بەغدا ناوی سوڵتان نـور الدیـن زەنگـی یـش ئەخوێندرایـەوە و سككەی بەناوی ئەوەوە لێدا ، وە لە خەزێنـــەی قەسـری خولـەفای فـاتمی دیارییەكی زۆر بەقیمەتی بۆ نارد .

بەڵام هەندێك لە سەركردەكانی سوڵتان نـور الدیـن كـە لـە فـەتحی میسردا لەگەڵ شێركۆ و صلاح الدین دا نەمابوونـــەوە ، ئەمانـە بـەردەوام هەوڵیان ئەدا كە دڵی سوڵتان نور الدیـن لەگـەڵ مـەلیك صـلاح الدیـن بگۆڕن بەهۆی ئەمە كاتێك سوڵتان نور الدین ڕووی كردە میسر و ویسـتی بیگرێ كە مەلیك صلاح الدین ئەم خەبـــەرەی بیسـت مەجلیســی شـورای كۆكردەوە و موزاكەرەی لەگەڵ كـــردن و یـەكێ لـە ئـەندامانی مـەجلیس

گوتی لازمە شەڕ لەگەڵ سوڵتان بکەی نجم الدین ئەیوبی باوکی کە ئەمەی بیست تووڕە بوو گوتی ولاتەکە ولاتی سوڵتانە و هەموومان غولام و تەبەعەی ئەوین وە لەسەر ئەمە مەجلیس بلاوەی کرد و لە پاشدا نجم الدین ئەیوب گەلی لۆمە و نەسیحەتی مەلیك صلاح الدین ی کوری خۆی کرد .

مەلیك صلاح الدین کاغەزێکی تابیعیەتی نووسی و بە تورانشای برای خۆی نارد بۆ سوڵتان نور الدین و بۆ تەئمینی وەزعەکە ، سوڵتان دوای ئەمە کە کاغەزی تابیعیەتی وەرگرت ئاشتبۆوە و داوای کرد مەلیك صلاح الدین بە لەشکریەوە بێ و لە فەلەستین یەکدگیربن و شەڕ لەگەڵ مەلیکی قودس بکەن مەلیك صلاح الدین چوو بەلام لە پێش چاوپێکەوتنی سوڵتان بەهۆی نەخۆشی باوکیەوە گەڕایەوە میسر چونکە لەم کاتەدا ئەمیر نجم الدین ئەیوب لە نزیك باب و نەسر لەوولاغ کەوتە خوارەوە و لە دوای چەند ڕۆژێك وەفاتی کرد .

سوڵتان نور الدین زەنگی لە گەڕانەوەی مەلیك صلاح الدین عادز بوو ، وە بڕیاریدا کە بە لەشکرێکەوە بچێتە سەر میسر و داگیری کاو مەلیك صلاح الدین عەزل بکا بەلام مەرگ ماوەی نەداو لەو ڕۆژانەدا وەفاتی کرد . ڕۆژی چوارشەممە ٢١ی شەوال ٥٦٩ك.

لەو بەینەدا دوننمای سلجیا هاتبوە سەر ئەسکەندەریە مەلیك صلاح الدین زوو دەفعی کرد و قەراڵی قودس یش مرد کە دوژمنێکی بە قوەتی

مەلیك صلاح الدین بوو . لەدوای وەفاتی سولتان نور الدین بۆ سەربەخۆیی مەلیك صلاح الدین ئیتر مانعێك نەما .

وە بەتەبیعەت حاکمیەتی شەرق و سەرداری ئیسلام کەوتە عۆدەی مەلیك صلاح الدین ڕەقیبێکی وای بۆ نەما کە بتوانێ بەرامبەری ڕاوەستێ .

لە دوای وەفاتی سولتان نور الدین زەنگی مەلیك صالح کە هێشتا منداڵێکی یانزە ساڵە بوو هاتە جێگەی سولتان نور الدینی باوکی وە بە هۆی بێ ئیدارەیی ئومەرای باوکی غەلەبەیان لێ سەند ، سەیف الدین ی ئامۆزای کە حاکمی موسڵ بوو ، ولاتانی جزیرەی سولتان نور الدینی داگیر کرد ، وە ئومەراکانی تریش هەریەکەو لەجێگەی خۆیدا کەوتە هەوای سەربەخۆیی سولتان صلاح الدین کەئەم حاڵەی بیستەوە کاغەزێکی بۆ وەزیری مەلیك صالح نووسی و لۆمەی کردن و گۆتی ئەگەر ئێوە خزمەتی مەلیك صالح نەکەن و موڵکەکەی نەپارێزن ئەوە من خۆم دێمە شام و پارێزگاری لێ ئەکەم ، بەلاّم حاکمی حەلەب گوێی بەقسەی سولتان صلاح الدین نەداو ، شمس الدین بن دایە ، مەلیك صالحی بانگ کردە حەلەب و گرتی و بۆ قایم کردنی جێگەی خۆی لەگەڵ حکومەتی فەرەنگی قودس دا ، لە دژی سولتان صلاح الدین ئیتفاقی کرد ، لەسەر ئەم کارە سولتان صلاح الدین کاغەزێکی بۆ خەلیفەی عەباسی المستضيء بالله ، نووسی و شکایەتی لەم شۆڕش و پاشاگەردانیەی مەملەکەتی مەلیك صالح کرد .

# سوڵتان صلاح الدین

لەدوای وەفاتی سوڵتان نور الدین زەنگی ولاتی شام و جزیـــرە کەوتـە دەست مـەلیك صالح کوری سوڵتان نور الدین بەلام بەهۆی بـــێ ئیدارەیـی ئومـەراکانی شـام و جزیـرە کەوتنـە هـەوای سـەربەخۆیی و هەریەکـــەو شوێنێکی بۆ خۆی داگیر کرد .

سیف الدین حاکمی موسڵ بوو ، کمشتکین بوو بە ئـامری سـەربەخۆ لەحەلەب و بەم جۆرە ولاتی شام و جزیرە یان لە مەلیك صالح داگیر کرد و لەسەر ئەمە سەرکردەکانی دیمەشق تکانامەیان بۆ سـوڵتان صـلاح الدیـن نووسی تاییانگاتێ و لەم تەهلوکەیە رزگاریان بکا .

سوڵتان صلاح الدیـــن دەسـت بـەجێ هەڵسـاو بەلەشـکرەوە دەشـتی (تیە)ی بری و لە خاکی قودس بەبێ ترس تێپەری و گەیشتە خاکی سوریە ، لەپێش حەرەکەتیدا نوسراوێکی بۆ خەلیفەی عەباسی بەغدا نووسی بـوو کە زۆر پێویستە سـوریەش بەدەسـتەوەبێ ، تـابتوانێ لەگـەڵ حکومـەتی فەرەنگدا خـەریك بـێ و پارێزگـاری لـە دەولـەتی ئیسـلام بکـاو چونکـە حکومەتی بێکارەی مەلیك صالح ئەم خزمەتەیان پێناکرێ و نەیان کردوە ، بەڵکو لەگەڵ دوژمنی دیندا رێك کەوتوون ، سوڵتان بەم جـۆرە یارمـەتی لە خەلیفەی بەغدا وەرگرت و لەلای هەموو کەس بە موجـاهیدی ئیسـلام ناسرا ، لەئەنجام سوڵتان بەلەشکریەوە هات و گەیشتە شام و لـە دیمەشـق چوە مـاڵی باوکی و لەوێ قەلاکەی تەسلیم کراو خەزێنـە و مـالێکی زۆری تیابوو هەمووی بەسەر خەڵکی شام دا ، دابـەش کـرد و هـەموو خـەڵکی

شامی کەیف خۆش کرد ، سولّتان لەدوای ڕێك خستنی ئیشوکاری شام سیف الاسلام طفتکین ی برای ، بەسەریەوە داناو ڕووی کردە حمس شارەکەی گرت و ڕووی کردە شاری حەما ، ئەویش تەسلیم بوو ، لەدوای ئەمە سولّتان ڕۆیی بۆ حەلەب و چوار دەوری شارەکەی گرت و گوتی من بە دوژمنایەتی نەهاتومە و بەڵکو بۆ ڕزگار کردنی مەلیك صالح لەدەس کمشتکین و هەندێك سەرکردەی تر هاتوومە ئەم ولاّتە .

کمشتکین کە چاوی بەو حاڵەکەوت ویستی بەیارمەتی فیداییی ئیسماعیلی ، سولّتان صلاح الدین لەناو بەرێ ناردیە لای مورشیدی ئیسماعیلی کە ناوی شێخ الجبل راشد الدین سنان ، بوو لەتەرەف ئەم شێخەوە چەند فیدایەك نێررا ، سولّتان پێی زانی و هەمووی کوشتن .

لەلایەکی تریشەوە ریاموند حاکمی ترابلس ، کەلەزەمانی سولّتان نور الدینەوە حەپس بوو کمشتکین ، بەرەلاّی کرد ، تا بەرامبەر سولّتان بوەستێ لەدوای بەربوونی لەگەڵ مەلیك بالّدوین ی قودس و یارمەتی دانی کمشتکین و بەلەشکرێکەوە ڕووی کردە شاری حمس ، سولّتان کەوای زانی وازی لە موحاسەرەی حەلەب هێناو ڕووی کردە لەشکری قودس بەلاّم ریاموند ، نەیوێرا بەرامبەر سولّتان بوەستێ و گەڕایەوە ، سولّتانیش بەعلەبەکی گرت و چووە شام .

دوای ئەمە مەلیك صالح داوای هێزی کرد لە سیف الدین حاکمی موسل ، ئەم حاکمە بەخۆی و لەشکریەوە هات و لەگەڵ لەشکری حەلەب یەکدگیر بوو ، هەردوولا ڕوویان کردە سولّتان صلاح الدین و لە ١٩ی

ڕەمەزانی ٥٧٠ك دا ، شەڕێکی قورس قەوما ، لەئەنجام لەشکری موسڵ و حەلەب زۆر خراپ شکاو سوڵتان تا حەلەب ڕاوی نان و لەو شارەدا موحاسەرەی کردن ، سیف الدین حاکمی موسڵ خۆی دەربازکرد و چووە موسڵ بەڵام لەشکری سوڵتان وازیان لیّ نەهێناو ڕوویان کردە موسڵ ، سیف الدین لەشکرێکی شەش هەزار کەسی بەپیرەوە نارد و لەتەل السلطان دا توشی لەشکری سوڵتان بوون و ئەمجارەش لەشکری موسڵ شکاو ڕایان کردە حەلەب ، سوڵتان لەدوای ئەم سەرکەوتنە لەڕێگەی دا قەلاّی بزاغە و منبج و ئەغزازی گرت و لەم کاتە دا چەند فیداییەك یەك لەدوای یەك هەڵیان کوتایە سەر سوڵتان و یەکێك شیرێکی لەسەری دا بەڵام لەبەر کلاّوزری کەم تەئسیری کرد و لەئەنجام هەموویان کوشتن .

ئەم فیداییانە لە تەڕەف کمشتکین ەوە نێررابوون سوڵتان لەدوای ئەم حادیسە قەلاّی حەلەبی زیاتر موحاسەرەکرد و ناچار داوای ئاشتی یان کرد بۆ ئەم مەبەستە کچێکی سوڵتان نور الدینیان نارد سوڵتان زۆر ڕێز و حورمەتی گرت و لەبەر خاتری ئەو کەسی ئازار نەدا و ئەسیرەکانی حەلەبی ئازاد کرد و برینداره‌کانی تیمار کرد .

لەئەنجام مەلیك صالح بە سوڵح ڕازی بوو ، بەم جۆرە جگە لە شاری حەلەب و دەروبەری هیچ جێگەیەکی تر بۆ مەلیك صالح نەمایەوە و هەمور کەوتە ژێر حوکمی سوڵتان صلاح الدین .

لەدوای ئەم سوڵحە سوڵتان دەستی کرد بەڕێك خستنی ئیشوکاری سوریە و فیرقەی ئیسماعیلیەی نزم کرد و تورانشای برای کەلەیەمەنەوە بۆ

دیدەنی هاتبوو کرد بە جێگری خـۆی و لەسـەر سـوریەی دانـاو گەڕایـەوە میسر . لەدوای خەلاّتی خەلیفەی عەبباسی گەیشتێ و بـەناوی خەلیفـەوە بوو بە سوڵتانی میسر و شام ، لەم ڕۆژەوە ناوی مەلیك صـالح لـە سـکەو خوتبە هەڵگیراو سکە بەناوی مەلیك ناسر یوسف بن ئـەیوب ەوە لێـدرا ، لەدوای ئەمە لەو سەفەرەدا هەرچی تالاّنێك دەس کەوتبوو هەمووی بەسەر لەشکردا دابەش کرد .

لەدوای گەڕانەوەی سوڵتان لەشام بۆ میسر ، فەرەنگ بە هەڵیان زانی و لە دوو قۆڵەوە ڕوویان کردە شام و شاری بەعلەبەك و ئەوناوەیان تـالاّن و وێران کرد و تورانشایان شکاند و زۆریان لە موسڵمانان بەدیل گرت .

سـوڵتان کـە ئەمـەی بیسـت بەلەشـکرێکی بچووکـەوە ڕووی کـردە فەلەستین و تا شاری ڕەملە ، هات و لەوێ تووشـی لەشـکرێکی بـەقوەتی فەرەنگ بوو کەوتنە شەڕەوە بەلاّم لەم شەڕدا فەرەنگ سەرکەوت سـوڵتان بەزۆر لەم شەڕەدا ڕزگاری بوو ٥٧٣ك .

ئەمیر عیسای هەکاری لەم شەڕەدا کەوتـە دەس فـەرەنگ لـەدواییدا سوڵتان بەپارە کڕییەوە .[1]

سوڵتان صلاح الدین گەڕایەوە میسر و ئەمجارە لەشـکرێکی بـەقوەتی کۆکردەوە و لە دوای سێ مانگ ڕووی کردە سـوریە و لەشـکری شامیشـی خستە تەك خۆی و تەنگی بە فەرەنگ هەڵ چنی ، لەلایەکی ترەوە فەرەنگ لەشـکرێکی نـاردە سـەر سـوریە و سـوڵتانیش ئـەمیر فرخشـای بـرازای

---

[1] - تاریخی کورد و کوردستان ،ل٨٩ .

بەلەشکرێکەوە ناردە بەرامبەریان فرخشا فەرەنگی خراپ شکاندو زۆر نەمابوو مەلیکی قودس بەدیل بگرێ بەلاّم پیاوێکی گاور کە ناوی همفری بوو مەلیکی قودسی رزگار کرد ، لەلایەکی تریشەوە سولّتان صلاح الدین خۆی بەلەشکرەوە چوە سەر قەلاّی یەعقوب و موحاسەرەی کرد و دەسی کرد بە تالاّن کردنی ئەترافی شاری سەیدار بەیروت .

مەلیکی قودس بۆ تۆلّە سەندنەوە ، بەلەشکرێکی زۆرەوە بەقوەتەوە رووی کردە لەشکری سولّتان و لە مبرج العیبون دا ، شەرێکی زۆر قورس لە بەیندا قەوما و فەرەنگ زۆر خراپ شکاو زۆریان لیّ بەدیل گیرا ، حاکمی ترابلس ریاموند ، حاکمی رەملە بولدوین ، حاکمی تەبەریە هرج ، وە هەندێك پیاوماقولاّنی تری فەرەنگیش بەدیل گیران . سولّتان لەدوای ئەم سەرکەوتنە بە دوومانگ هاتەوە سەر قەلاّی یەعقوب و لەماوەی پێنج رۆژدا گرتی و پاسەوانانی فەرەنگی بەدیل گرت و قەلاّکەی روخاند .

بەهۆی لەدەست چوونی قەلاّی یەعقوب فەرەنگ کەوتە ترسەوە و داوای شەڕ وەستانی دووسالّی کرد و سولّتان قبولّی کرد جگە لە حاکمی ئەنتاکیە هەموو سەرکردەکانی فەردنگ لەم سولّحەدا بەشدار بوون .

سولّتان صلاح الدین ویستی لەم فرسەتەدا ، ئیشوکاری جزیرەش ساغ بکاتەوە ، حاکمی حصن کیف نور الدین کەزاوای قلیج ئەرسەلان ی حاکمی سەلجوقی رۆم بوو لەگەلّ خەزووریدا تێك چوو بوو لەسەر ئەوە قلیج ئەرسەلان ویستی شەڕ لەگەلّ نورالدین بکا ، هەرچەندە سولّتان لەڕووداوی حصن رعبتن وە رقی لە قلیج ئەرسەلان بوو بەلاّم دیسان نەی

ویست خوێن لەبەینی موسڵمانان بڕژێ و ڕێکی خستن و خۆشی چوە سەر حاکمی ئەرمینیای بچووك کە ناوی روبین بوو شکاندی و ناچار بوو سوڵحی کرد دوای ئەمە هەموو حکومەتە بچکۆڵەکان گەورەیی سولتان صلاح الدینیان قبوڵ کرد و بڕیاریان دا بۆ ماوەی دووساڵ شەڕ لەگەڵ یەکتر نەکەن .

حاکمی موسل ، جزیرە ، هەولێر ، حصن کیف ، ماردین ، مەلیکی رۆم و ئەرمینیاش داخیلی ئەم تفاقنامە بوون .

بەم جۆرە شەڕ لەنێوان موسڵمانان دوایی هات و شۆرەتی گەورەیی سوڵتان صلاح الدین بەناو ولاّتانی بەینی بەحری ڕەش و خەلیجی فارس و بەحری سپیدا بلاّو بۆوە و ، بەهۆی ئەمە قوەتی ئیسلام بەرامبەر بە فەرەنگ پەیدا بوو .

لەدوای ئەمە سوڵتان بەدڵێکی خۆش گەڕایەوە بۆ میسر و ئەمیر فەرخشای برازای بەسەر شامەوە بەجێ هێشت .

لەم کاتەدا تورانشای برای کە حاکمی ئەسکەندەریە بوو وەفاتی کرد لە ٥٧٦ك .

دوای ئەمە سوڵتان دەسی کرد بەرێك خستنی ئیشوکاری میسر و کردنەوەی مەدرەسەو چاککردنی رێگەو بان و قایم کردنی ئەسکەندەریە .

لەم کاتەدا سوڵتان خەبەری بۆ هات کە رینۆڵد ئەرنات حاکمی شاری کرك ، تفاقنامەی ئاشتی هەڵوەشاندەوە و ، کاروانێکی بازرگانی ئیسلامی کە لەنزیك کرن تێپەرین تالاّن کرد ، وەلە هەمان کاتدا گەمیەکی

حەجاجی مەسیحی لای دابوە شاری دمیات ، سولّتان بۆ بەرامبەریی بە معامەلەی حاکمی کرك ، ئەو حەجاجانەی گرت .

هەر لەوماوەیەدا حاکمی موصل و جزیرە ئەمیر سیف الدین غازی وەفاتی کرد جزیرەی بۆتانی دابوو بە سنجەرشای کوڕی و ئاکرەی دابوو بە ناصر الدین کشك و باقی ولاّتانی موصلّ و جزیرەشی وەسیەت کرد بوو بۆ عزالدین مەسعودی کوڕی .

پاش ماوەیەکی تر مەلیك صالح کوڕی سولّتان نور الدین زەنگی یش وەفاتی کرد لە ٥٧٧ك ، ئەویش حەلەبی وەسیەت کرد بوو بۆ عزالدین مەسعود بەلاّم ئەمیر عزالدین لەدواییدا حەلەبی بەرامبەر ، بە سنجار ، دابە عیمادالدینی برای .

سولّتان صلاح الدین لە وەفاتی مەلیك صالّح و زەوت کرانی حەلەب لە تەرەف عیمادالدینەوە زۆر سەخلّەت بوو بەلاّم لەبەر تفاقنامەی دوو ساڵەی نێوانیان مومکین نەبوو بچێتە سەری و چونکە سولّتان قەت تفاقنامەی نەشکاندوە لەگەلّ ئەمەشدا هێشتا ماوەی چوار مانگ مابوو تفاقنامەکە تەواوبێ ، کەچی خەبەری بۆهات هەندێك لە حاکمەکانی جزیرە لەگەلّ شێخی جەبەل و فەرەنگدا لە دژی سولّتان خەریکی ڕێك کەوتنن .

لەسەر ئەمە سولّتان بەلەشکرەوە ڕووی کردە شام ، بارگرانی لەگەلّ تاج الملوك بوری برای خۆیدا ناردە شام و خۆی بەلەشکرەوە لە مانگی سەفەری ٥٧٨ك دا ، گەیشتە شام .

دوای چەند ڕۆژێك دیسان هەڵی کوتایە سەر وڵاتی فەرەنگ زۆری لێ کوشتن و شاری بیسان یشی گرت و گەڕایەوە شام لەدوای مانگێك چوو شاری بەیروتی لەتەرەفی بەحرەو بەرەوە موحاسەرە کرد ، بەلاّم لەپێش گرتنی بەیروت ، ڕووی کردە جزیرە لەم بەینەدا ماوەی تفاقنامەکە تەواو بوو .

زۆربەی حاکمانی جزیرە چوونە ژێر فەرمانی سوڵتانەوە ، دوای ئەمە چوو موسڵ بگرێ و موحاسەرەی کرد بەلاّم لەدوای دوومانگ موسڵی بەجێ هێشت و چوو سنجاری گرت و لەدوای موحاسەرەیەکی هەشت ڕۆژی ئەو قەڵا مەحکەم و گەورەیەی گرت .

لەم کاتەدا خەبەری بۆهات کە عیمادالدینی حاکمی حەلەب لەدژی سوڵتان لەگەڵ فەرەنگدا ڕێك کەوتوە و ئەیانەوێ هێرش بکەنە سەر وڵاتی سوڵتان دوای ئەم خەبەرە لە فورات پەریەوە و لە ڕێگەدا غیتانی گرت و لەپاشدا چوو حەلەبی موحاسەرە کرد .

عیمادالدین کەزانی ناتوانێ خۆی ڕابگرێ داوای لە سوڵتان کرد لەباتی حەلەب ، سنجار و ئەم شوێنانەی سەر بە سنجارن وەکو نەسیبین ، خاپور ، رقە و سروج ، بداتێ سوڵتان ڕازی بوو ن بەم گۆڕینەوەیە و ، داخیلی حەلەب بوو لەکاتی موحاسەرەی حەلەبدا بوو کە خەبەری وەفاتی مەجد الدین بوری برای بۆ هات و زۆر عادز بوو ، قازی شام محی الدینی کوڕی زەکی لەدوای گرتنی حەلەب ئەم دووبەیتەی بۆ سوڵتان نووسی و فەرمووی :

وفتحكم حلباً بالسيف في صفر

مبشـر بفتـوح القدس في رجب

ئەم شیعرەی قازی محی الدین وەکو کەرامەتێك بـوو چونکـە سـوڵتان چوار ساڵ دوای گرتنی حەلەب قودس یشی ڕزگار کرد لە مانگی ڕەجەب . هەروەك چۆن قازی موژدەی پێدا بوو لە حەلەب ز لە دوای گرتنی حەلـەب شۆرەت و گەورەیی سوڵتان بەتەبیعەت زیـاتر بـوو ، وەبەگـەورەی هـەموو ئومەرای ئیسلام ناسرا ، لەم کاتەدا فەرەنگ لە وەفاتی فەرخشای جێگـری سوڵتان لەشام سودیان وەرگـرت و تـا نزیکـی شـام ولاتیـان تـالان کـرد لەلایەکی تریشەوە ئەمیری کەرەگ ، تا مەدینەی پـیرۆز ئـەو نـاوەی وێـران کرد و ئەوەندەی نەمابوو کە مەدینەش بگرێ ن بەلاّم ئەمیر لۆلۆ بـەفریادا گەیشت و لەشکری کەرەکی شکاندو زۆری لیّ بەدیل گرتن .

سوڵتان لەم کارە زۆر عادز بوو دەس بـەجێ بەلەشـکرەوە لـە چـەمی ئەردەن پەڕیەوە و گەیشتە شاری بیسان و سـوتاندی و دواتـر چـوو شـاری کەرەکی موحاسەرە کرد و ، دوای ئەمە فەرەنگ داوای شەڕوەسـتانی چـوار ساڵەیان کرد و ، سوڵتان ئەم داوایەشی قبوڵ کرد و گەڕایەوە شام .

لەم کاتەدا حاکمی موسڵ بەرەزامەندی خەلیفەی عەبباسـی ویسـتی لەگەڵ سوڵتاندا سوڵح بکـاو سـوڵتان بەلەشـکرەوە ڕووی کـردە موسـڵ و موحاسەرەی کرد و پاشان وازی لە موسڵ هێناو چوو شاری میا فـارقین ی گرت و گەڕایەوە سەر موسڵ لە ئەنجام بە ئاشـتی لەگـەڵ حـاکمی موسـڵ ڕێك کەوت لەسەر هەندێك خاڵ وەکو خوتبە خوێندن و سکە لێدان بەناوی

سوڵـتان صلاح الدین وز ، وازهێنـــان لـە هـەندێك شـارو شـارۆچکە بـۆ سوڵـتان ، بەگوێرەی ئەم سوڵحە سوڵـتان بوە حوکمداری جزیرە و بەشێکی کوردسـتان ، واتـە : دەوڵـەتی ئیسـلام لەسـەردەمی عەبباسـیەکان دا ، لەولاتی سودان و مەغریب و میسرەوە تاکوردسـتان کەوتـە ژێـر حوکمـی سوڵـتان صـلاح الدیـن ، تـەنیا عـێراقی عـەرەب و ئـێران و ئـەفغان و باکستان و هەندێك شوێنی تر لەژێر حوکمی خەلیفەی عەبباسی لە بەغدا مایەوە .

## سوڵتان صلاح الدین و خاچ پەرستەکان

سوڵتان لەدوای ئەمە کە ئیشوکاری سـوریە و جزیـرە و بەشـی زۆری کوردستانی بەشەڕو ئاشتی بڕییەوە و ئەو هێزە بـلاوەی کـە سـەرکردەکانی ئیسلام بەزۆری لەشەڕی ناوەخۆیان سەرف ئەکرد ، هەمووی کۆکردەوە و بۆ گەیشتن بەو مەبەستەی خۆی کە ڕزگار کردنی قودس و دەرپـەڕاندنی خـاچ پەرستەکان بوو لە فەلەستین ، دوای ئەمـــە دیسـان فـەرەنگ تفاقنامـەی ئاشتی چوار ساڵەیان شکاند و پێش تەواو بوونی چوار ساڵەکە لـە ٥٨٢ك دا ، ئەمیری کەرەگ ، کاروانێکی گەورەی ئیسلام لـە کـاتێکدا کـە نزیـك کەرەگە وە تێپەر ئـەبوو هـەموو ماڵکـەی لێ سـەندن و ژن و پیاوەکەشـی بەدیل گرتن ، بەڕیوایەتێك خوشکی سوڵتان صلاح الدین یش لـەناو ئـەم دیلانە دا بوو ، ڕینۆڵد بەمـــەش ڕازی نـەبوو هـەندێك سوکایەتیشـی بـە

ئایینی پیرۆزی ئیسلام کرد ، سولتان بەم کارە زۆر عادز بوو سوێندی خوارد ئەگەر رینۆڵد بگرێ ئەبێ بە دەستی خۆی بیکوژێ .

لەدوای ئەم ڕووداوە سولتان مەجلیسی شورای جەنگی کۆکردەوە و ئەم مەجلیسە بڕیاری بەشەڕی فەرەنگدا ، لە ڕۆژی پێنج شەمی مانگی ربیع الاول ساڵی ك لەشکری ئیسلام بە بەردەمیدا ڕابورد وە ڕۆژی دوایی لە دوای نوێژی جومعە لە خوار تەبەریە لە چەمی ئەردەن پەڕیەوە و دوژمن کە لە سخوریە بوو هێزێکی بەرامبەر دوژمن دانا و خۆی چوە سەر تەبەریە و گرتی و ڕۆژی دوایی لەشکری ئیسلام بەهەڵمەتێکی شێرانە ڕوویان کردە لەشکری فەرەنگ و تەفر وتونایان کردن ئەم ڕۆژە ڕۆژی ڕووخانی بناغەی دەوڵەتی فەرەنگی فەلەستین بوو ، لەم شەڕەدا مەلیك جۆی و ئەمیری کەرەگ و برای مەلیك و هەندێك سەرکردەی تریش لەگەڵ فەرەنگێکی زۆر بەدیل گیران ، داری سەلیبیش لەناو تالاّن دا بوو لەو ڕۆژەی کە سەلیبی هاتبوە ئەم ناوە تا ئەو ڕۆژە تووشی شکستی وا گەورە نەبوو بوون .

دوای ئەمە خێوەتێکیان بۆ سولتان هەڵداو مەلیك جۆی و ئەمیری کەرەگیان هێناو مەلیك جۆی داوای ئاوی کرد بەفراویان بۆ هێناو تۆزێکی لێ خواردەوە و دای بە ئەمیری کەرەگ ، بەلاّم سولتان گوتی ئێمە ئەو ئاوەمان بەو نەداوە و پاشان باسی وەحشیەت و غەدری ئەمیری کەرەگی دەرحەق بەکاروان و حەجاجی موسڵمانان کرد و لەپاشدا بەدەستی خۆی کوشتی و سوێندەکەی هێنایە جێ مەلیك جۆی لەم کارە ترسا بەلاّم

سوڵتان دڵخۆشی دایـــەوە و لەگـەڵ بـاقی دیلـەکان بـەڕێز و حورمەتـەوە ناردنی بۆ شام . تەنیا لەناو ئەمانـەدا دووسـەد کەسـێکی هـەڵبژارد کـە خراپە و زوڵمێکی زۆریان دەرحەق بە ئیسلام و موسڵمانان کـرد بـوو ئـەم دووسەدی کوشت .

دوای ئەمە سوڵتان چوە سەر تەبەریـەو گرتنـی و دواتـر ڕووی کـردە عەککاو ئەم قەلاَیەش تەسلیم بوو ، دوای ئەمـە سـوڵتان مـەلیك عـادلی برای خۆی نارد تالە سنووری میسرەوە دەس پێ بکاو مەلیك عـادل حصـن مەجدەل یاناو یافای گرت و دیلێکی زۆری دەس کەوت .

سوڵتان خۆشی لەشاری عەککاوە هەندێ قۆڵی ناردە شـاری ناسـرە و قیسـارە ، سـەیفا ، سـەفوریە ، شـەقیف و عەفولـەی گـرت . لەلایـەکی تریشەوە شاری نابلس و سبستیەو هەندێ شارۆچکەی تری ئەو ناوەی گـرت . دوای ئەمە سوڵتان خۆی چوە سەر شاری تینین و گرتـی و پاشـان شـاری سەیدای بێ شەڕ گرت و شاری بـەیروت لـەدوای ئەمـە ڕوویکـردە شـاری عسقەلان و موحاسەرەی کرد و چواردە ڕۆژ لەگـەڵی خـەریك بـوو نـەگیراو پاشان بەشیدەت هجومی کردە سەری و گرتی لەدوای ئەمە شاری غـەزە و ، ڕەملە ، خلیل الرحمن بیت اللحم و چەند جێگەیەکی تریشی گرت .

ئەم هەموو سەرکەوتنە یەك لەدوای یەکە لە ماوەی دوو مـانگدا بـۆ سوڵتان مەیسەر بوو بەڕاستی ئەمە بۆ هیچ پادشایەك نەبوو بوو ، لەدوای ئەمە ڕێگەی قودسی شەریف بۆ ئیسلام کرایـەوە ، سـوڵتان دەیزانـی کـە ئەهەمیەتی ئەو شارە پیرۆزە لەلای ئیسلام و گاور زۆر گەورەیە لەبەر ئـەوە

نەیویست بەشەر بیگرێ و تووشی موحاسەرە و تەخریبی بکا بەم فیکرە باشە ژمارەیەك پیاوی دیار و ناسراوی نارده قودس تا بۆ تەسلیم بوونیان قسە لەگەڵ خەڵکەکەی بکەن بەلاّم فەرەنگی ئەوێ تەکلیفی تەسلیمیان قبوڵ نەکرد لەم کاتەدا سەرکردەی قودس حاکمی رەملە بلبان بوو لە شەڕی تەبەریە کە بەشەڕی حطین بەناوبانگە بەدیل گیراو ئیزنی لە سوڵتان وەرگرت کە بچێتە قودس ماڵەکەی بهێنێ و شەوێك زیاتر لە قودسدا نەمێنێتەوە ، بەلاّم لە قودس دا مایەوە و بوو بە قومانداني مودافەعەی شارەکەو شەست هەزار کەسێکی لێ کۆبۆوە و گەورەی قەشەکانی قودس خەزێنەی کلێسای بۆ کردەوە تا بۆ مودافەعە سەرفی بکا .

سوڵتان صلاح الدین کەوایزانی بەلەشکرەوە ڕووی کردە قودس و لە ١٥ ی ڕەجەبی ٥٨٣ك دا گەیشتە ئەوێ و دەورەی دا لەدوای پێنج ڕۆژ لای باکووری بۆ هجوم بە پەسەند زانی و جەبەل زەیتون ی کرد بەبنکەی ئۆردووەکی و لەوێوە دەستی کرد بە هەراسان کردنی شارەکە ، لەشکری ئیسلام لە چاڵەکەی دەوری تێپەر بوون و شوورەی شارەکەیان کون کرد ، دوای ئەمە فەرەنگ داوای خۆبەدەستەوە دانیان کرد بەو مەرجەی کە لەماوەی چل ڕۆژدا فەرەنگ بەسەربەستی لەشارەکە دەربچن و هەرپیاوێك دە دینار و ژن پێنج و منداڵ دوو دینار فیدیەی رزگار بوون بدەن ، هەروەکو قازی شام محی الدین لەدوای گرتنی حەلەب تەخمینی کرد بوو لە مانگی ڕەجەبدا واقیع بوو ، سوڵتان ئەم قازییەی بانگ کردە قودس تالە

ڕۆژی فەتحیدا وەزیفەی خەتیبی بەجێ بــهێنێ وە ئــەو جومعەیــە نوێژکــەر ئەوەندە زۆر بوو کەمزگەوتی قودس نەیتەگرت .

قازی محی الدین ئەم شیعرەی کرد بە پێشەکی خوتبەکەی :

الحمد لله الذي ذلت دولــة الصـليبي

وعز بالكردي دين مصطفى العربيس

واتە : سوپاس بۆ خوا کە دەوڵەتی سەلیبی زەلیل کرد و

وە ئابینی پیرۆزی ئیسلام یشی بەکورد بەهێز کرد .

سوڵتان بڕیاری دا کە مەسیحیەکانی قودس وەکو مەسـیحی شـارانی تر هەر لە جێگەی خۆیان بەسـیفەتی تەبەعـە بمێنینـەوە لـە قـودس ، وە ژمارەی ۱۷هەزار هەژاری فەرەنگی یشی لەفدیە عەفوکرد ، جگـە لەمـە ڕۆژێکیش لە سبەینێ وە تا ئێوارە بەبێ فیدیـە موسـاعەدەی دە رچوونـی فەقیر و هەژارەکانی فەرەنگ کرا . وە ڕێگەی بە قەشەو مـاڵ و ڕاهیبـەکان دا کە تا ئەتوانن شتومەك لەگەڵ خۆیان بەرن . بەتایبەتی زۆر حورمـەتی هـەژار و ژن و منـداڵ و پیرو پەککەوتـەی ئـەگرت و یارمـەتی ئـەدان و مەلیکە سیبیلی بەڕێز و حورمەتــەوە لەسـەر ئـارەزووی خـۆی نـاردە لای مەلیك جۆی مێردی کەلە نابلس بەند کرابوو ، وە هندێ لە ژنانی فەرەنگ کە گەیشتنە لای سوڵتان تکای بەردانی مێرد و کوڕ و باوکیـان کـرد لـە سوڵتان تکای بەجێ هێنان و بەرەلای کردن . ئەم موعامەلەی ئینسـانیەی سوڵتان دەرحـەق بـە فـەرەنگی فەلەسـتین و قـودس بەتـەواوی عەکسـی

موعامەلەی ئەوان بوو دەرحەق بە موسڵمانان کە لەساڵی ٤٩٢ی‌ك دا کە غودفری قودسی گرت بە ئیعتیرافی خۆیان نزیکەی حەفتا هەزار موسڵمانیان قەتل و عام کرا .

سوڵتان صلاح الدین نزیکی مانگێك لە قودس مایەوە دوای ئەمە رزگار کردنی قودس لەتەرەف موسڵمانانەوە ئەوروپای خستە تەعەسوب و ئیش و تەلاشەوە لە ئەنجام قوەتێکی گەوردیان کۆکردەوە و ڕوویان کردە فەلەستین ئیمپراتۆری ئەڵمانیا و مەلیکی ئینگلیز کە بە ڕیشاری شێر دڵ ناسرابوو لە سەرکردەی هەرە گەورەی ئەم ئەهلی سەلیبە بوون ، سوڵتان صلاح الدین لەم ماوەیەدا هاتەوە شام و لەوێ لەشکرێکی زۆری هەڵگرت و ڕووی‌کردە ترابلس و ئەنتاکیە لەدوای زەوت کردنی ئەنترۆس مەلیك جۆی بەرەلاّ کرد و بەڵێنی دا کەلەشام نەمێنێتەوە و بچێتەوە بۆ ئەوروپا و قەت بەرامبەر سوڵتان شەڕ ناکا بەلاّم ئەم مەلیکە درۆی لەگەڵ سوڵتان کرد چوە تەرابلس و بەقایەی ئەهلی سەلیبی کۆکردەوە و لەپاشدا لەگەڵ لەشکری سور چووە شاری عەککا .

سوڵتان جگە لەشاری سور هەموو شاران و قەلاّی فەلەستینی گرت بەلاّم مانەوەی شاری سور بەدەس فەرەنگەوە مەترسی‌یەکی گەورە بوو لە ئەنجامدا شاری سور بوو بە بنکەیەکی سەرەکی بۆ لەشکری ئورروپا لەسەرەتای ساڵی ٥٨٥ك دا ، چۆنیەتی عەسکەریەی سوڵتان گۆراو لە هێرش و پەلامارە و کەوتە خۆپاراستنەوە .

کونـاردی قومـاندانی سـور لەشـکرێکی بـەقوەتی پێکـەوەنا ئـەم حەرەکەتە سەرەتای فەرتەنەیەکی گەورە بوو کە ڕووی ئەکردە وڵاتی ئیسلام ، مەلیك جۆی کە بەڵێنی دا بوو شەڕ لەگەڵ سـوڵتان نـەکا لـە بـەڵێنی خـۆی پـاش گـەز بـۆوە و لەشـکرێکی زۆری لـە تـەرابلس کۆکـردەوە و کەشتیەکانی فەرەنگ بەردەوام ئەهاتن ئەرزاق و سیلاحیان بۆ ئەهێنا .

سوڵتان صلاح الدین بەرامبەر بـەم هێزکۆکردنـەوەی فـەرەنگ خـۆی ئامادەکرد و لەلایەکی تریشەوە قەڵای ئـەرنونی موحاسـەرە کـرد ، بـەڵام کەدی فەرەنگ تەنگی بەشاری عەککا هەڵچنیوە بەشـێکی لەشـکری لـە دەوری قەڵای ئەرنون بەجێ هێشت و خۆی ڕووی کردە عەککا موحاسـەرەی عەککا نزیك دووساڵێك بەردەوام بـوو ، هـۆی دەوام کردنـی موحاسـەرەش یەك لەدوای یەك هاتنی هێزی فەرەنگ بوو . دوای ئەمـە سـوڵتان کـەدی فـەرەنگ لەگـەڵ موحاسـەرە خـەریکن ڕووی کـردە قوەتـی فـەرەنگ و بەتایبەتی ئەمیر تقی الدینی برازای بەڕاستی هجومێکی شێرانەی کـرد و تەرەفێکی عەککای بەفەرەنگ چۆڵ کرد و ڕێگەی بـۆ شـارەکە کـردەوە و سوڵتان خۆشی چوە ناو شاری عەککا .

بەڵام کە شەوهات بەسەردا لەشکری ئیسلام گەڕانەوە ئۆردووگاو لـەم فرسەتەدا فەرەنگ ئەو ڕێگەیەی کە ئیسلام بەڕۆژ گرتبووی بەربەستی کرد بەجۆرە ڕەنجی سوڵتان بەزایەع چوو .

سامی دوژمن بەجۆرێك شکا کە لە ٥ی ڕەمەزانی ٥٨٥ی دا ، بێجگە لە موحاسەرەی قەڵاکە هجومێکـی بەشیددەتیشـی کـردە سـەر لەشـکری

ئیسلام زۆر بلاّو بوو بۆوە ، بەشێکی بەرامبەر بەئەمۆندی فـەرەنگ وەسـتا
بوو لەشاری ئەنتاکیە و قوەتێکی تر بەرامبەر بە تەرابلس ی شام دیمەشقی
ئەپاراست وە قوەتێکی تریش بەرامبەر بە ئەهلی سەلیب شاری دمیـات و
ئەسکەندەریەیان ئەپاراسـت ، لەلایەکـەوە تەئسیری ئـەم نیـوە شـکانە و
لەلایەکی ترەوە بەسەراهاتنی زستان و ڕەمـەزان و سـوز بوونـی ئومـەرای
ئیسلام بۆ شەڕ نەکردن و گەڕانـەوە ، سـوڵتان صـلاح الدینـی مـەجبوری
هاتنە دواوە تا خرو بەکرد و عەککای سپارد بـە قـەزاو قـەدەر ، سـوڵتان
سەلاح الدیـن لـە غـیرەت و خۆڕاگـری فـەرەنگ و سسـتی و خـۆ لەشـەڕ
پاراستنی ئیسلام زۆر عادز بوو هەر لەم کاتە دا بـوو کـە خەبـەری داخـل
بوونی ئیمـپڕاتۆری ئـەڵمانیا فریدریـك بربـرۆس ، بـە ئـەهلی سـەلیب و
جەرەکەت کردنـی بـۆ فەلەسـتین گەیشـتە سـوڵتان ، پیشـداری ئۆردوی
ئەڵمانیا گەیشتبوە باکووری کلکیا نزیکەی سەد هەزار سەرباز بـوو بـەلاّم
ئیمپراتۆری ئەڵمان لەڕێگەی هاتنی لە ئاودا خنکا لە ڕووباری سـالف لـە
چیـای ئـەرمینیا بـەم هۆیـەوە لەشـکری ئـەڵمان بەشـێکی گەڕایـەوە و
بەشەکەی تریش سـواری کەشـتی بـوون و بـۆ شـاری عـەککا و سـوور ،
بەسەرکردایەتی فردیك دوسـواب ، کـوڕی ئیمـپراتۆری پێشـووی ئـەڵمان
بەسەر ئەنتاکیەدا ڕووی کردە فەلەستین لە ئەنجام تەنیا ژمارەیـەکی هـات
گەیشتە عەککا ، جا جەنگی خاچ پەرستانی سێ یەم بەوە جودا ئەکرێتەوە
کەوا گەورەترین مەلیکی ئەوروپای ئەم کاتە بەشداریان تیا کرد لەوانە :

١-ئیمپراتۆری ئەڵمانیا فریدریك بربرۆس

٢-مەلیکی فەرەنسا فریدریك ئوغستس

٣-مەلیکی ئینکلیز ڕیتشارد قەلب الاسد

سوڵتان سەلاحەدین بەرامبەر بە لافاوی ئەهلی سەلیب و ئەم لەشکرە زۆرە زەبەلاحە داوای کۆمەکی لە حوکمداران و ئومەرای ئیسلام کرد و هەتا بۆ داوای یارمەتی کۆمەڵێك لە پیاوانی خۆی ناردەلای مەلیکی مەراکیش یعقوب المنصور ، زۆر حەیف کەلە هیچ لایەکەوە گوێ نەدرایە قسەی سوڵتان و کەس یارمەتی بۆ نەنارد ، وە بە جۆرە ئەم قەهرەمانی کوردی گەورەی ئیسلامە ، بەرامبەر بە ئەهلی سەلیب تەنیا بە لوتفی خوا و قوەتی خۆی ڕاپەڕموو .

سوڵتان صلاح الدین لەگەڵ لەشکری ئینگلیز فەرەنسا و ئەڵمانیا وقودس :

لەڕۆژی ٢٠ی جیمادی دووەمی ٥٨٦ك دا لەشکری ئینگلیز و فەرەنسا و ئەڵمانیا و قودس هێرشیان کردە سەر لەشکری سوڵتان سەلاح الدینی ئەیوبی کورد لە فەلەستین لەسەرەتای شەڕەکەدا ، بەشێکی لەشکری ئیسلام خراپ شکاو بڵاوەی کرد ، هەندێك لەوانە تا تەبەریەو شام خۆیان نەگرتەوە و لەشکری خاچ پەرست تا ئۆردوگای سوڵتان هات ، بەلام لەپاشدا موتەبەقی قوەتی ئیسلام هەڵیان کوتایە سەر لەشکری خاچ پەرستان و زۆر خراپ شکاندیانن ، گۆڕەپانی شەڕەکە پڕ بوو لە کوژرا و ورە و جورئەتی لەشکری خەڵکی سەلیب بەتەواوی ڕووخا ، لە ٢٢ی

جیمادی الاخری ٥٨٦ك دا لەشکرێکی زۆری خەڵکی سەلیب لە قوماندای قۆنت هانری دا ، کە خوشکەزای قەراڵی ئینگلیز بوو ، گەیشتە بەردەمی شاری عەککا و ئۆردوگای دامەزراند وە خۆی بۆ هجوم حازر کرد .

میر عیسای هەکاری و بەهاءالدین قرقوش زۆر مەردانە بەرامبەر هەموو هجومی خاچ پەرستان وەستان ، مێژوو نووس میشۆ ناو ، زۆر مەدح و سەنای غیرەت و خۆڕاگری میر عیسای هەکاری و بهاء الدین قرقوش ئەکا ، ئەڵێ زۆر جار هجومی دوژمنیان شکاندو پاش کشەیان پێکرد .

قونت هانری ، بەرامبەر بە ئازایی و خۆڕاگری ئەم دوو سەرکردە کوردە قارەمانە هیچی پێ نەکرا ، لەو ماوەیەدا خواردەمەنی لە هەردوولادا زۆر کەم بوو بوو ، بەلاّم سوڵتان سەلاح الدین لە بەیروتەوە هەندێ خواردن و خۆراکی گەیاندە جەنگاوەرانی قەلاّو شاری عەککا .

لەلایەکی ترەوە خاچ پەرستەکان کەزانیان موحاسەرە بری ئەوەندە کارناکاتە سەر لەشکری ئیسلام هاواریان نارد بۆ پاپا ، وسەر لەنوێ لە ئەوروپا پڕوپاگەندە دەستی پێکرد و قوەتێکی زۆری سەلیبیەکان بێ دەرپێ گەیشتە بەردەمی عەککا ، قۆنت هانری ، بە لەشکرێکی زۆرەوە هێرشی کردە سەر لەشکری ئیسلام ، لەو کاتەدا سوڵتان سەلاح الدین نەخۆش بوو ، لەژێر خێوەتێکدا دانیشت و سەیری مەیدانی شەڕی ئەکرد ، شەڕ گەلێ درێژەی کێشا بەلاّم لە ئەنجام دا خاچ پەرستەکان زایعاتێکی زۆریان دا ، دانەری کتێبی مصور تاریخ ئیسلام ، سەید عەلی ، ئەڵێ ئەگەر سوڵتان

سەلاح الدیـن ، خـۆی سەرپەرشـتی شـەڕی بکردایـە بەڕاسـتی لەشـکری ئیسلام سـەرکەوتنێکی گـەورەی دەس ئەکـەوت ، لـەم ماوەیـەدا بـەهۆی فەرتەنە ، دوننمای فەرەنگ لە عەککا دوور کەوتبۆوە و لەشـکری ئیسـلام لەم فرسەتەدا سوودیان وەرگرت و مودافیعینی قەلاّی عەککا یـان گـۆڕی بەلاّم خیلافی ئارەزووی سولّتان لەشکرێکی کەمتر یان تیا داناو لەلایـەکی تریشەوە سیلاح و جبەخانەیەکی تەواویان نەدانێ ئەمیر سەیف الدین عەلی مەشتوب ، کرا بە قومانداری عەککا . هەندێ لە مێژوو نووسـان ئـەڵێن هۆی لەدەسچوونی عەککا ، کەمی هێز و شەڕکردنی نابـەدڵیان و هـاتنی ئیمدادێکی زۆر بۆ ئەهلّی سەلیب بوو .

قـەڕاڵی فـەرەنگ فلیـب ئۆگوسـت بەلەشـکرێکی زۆرەوە گەیشـتە بـەردەمی عـەککا ، ئـەم قوەتـە تازەیـە دڵخۆشـیەکی باشـیدا بـەخاچ پەرسـتەکان و سـوڵتان لەسـەر ئەمـە داوای کۆمـەکی لەسـەرکدەکانی ئیسلامی تابیعی خۆی کـرد ، زۆری پێنـەچوو قـەڕاڵی ئینگلیـز ڕیشـاری شێردل یش ، کەبـە جورئـەت و ئـازایی لـە ئـەوروپا دا بەشـۆرەت بـوو ، گەیشتە عەککا . موحاسەرەی عەککا لەتەرەف بەحرو بەرەوە ، بەشـیدەت دەوامی کرد .

بەلاّم لە ئەنجام پارێزەرانی قەلاّی عەککا تووشی برسـیەتی و تـاعون بـوون و لـە ژێـر بـاری ئـەم ناخۆشـیەدا زۆر بـێ هـێز کـەوتن ، توانـای مقاوەمەتیان بە تەواوی شکا بوو قەلاّی عەککا دووساڵ بوو بەرامبـەر بـە هێزی سەلیبیەکان بە هیمەتی موجاهیدانەوە خۆی ڕاگرتبوو ، بـەلاّم ئیتر

کەلکی پێوە نەمابوو داوای یارمەتی لە سوڵتان کرد بەڵام قوەتی ئیسلام ئەوەندە نەبوو یارمەتیان نەدرا .

لەبەر ئەمە قوماندانی قەڵای عەککا ئەمیر سەیفە دین عەلی مەشتوب ، بەرامبەر بەم وەزعیەتە چوەلای قەڕاڵی فەرەنساو پێی گوت ئێمە شارەکەتان تەسلیم ئەکەین بەمەرجێك ئێوەش هەمان موعامەلەمان لەگەڵ بکەن ، فلیب ئۆگۆست بەرامبەر بەم تەلکلیفە ماقولە گوتی من قەت ڕازی نابم کە یەکێك لە مەسڵمانانی قەڵاو شاری عەککا بەساغی بمێنێ لەسەر ئەم وەڵامە ئەمیر سەیف الدین گەڕایەوە عەککا .

عەککا ماوەیەکی تر خۆی ڕاگرت بەڵام برسیەتی و نەخۆشی مەیدانی نەدا و لەئەنجام بەشەرتی پاراستنی گیانی موسڵمانان تەسلیم بوو . بەگوێرەی تفاقنامەی تەسلیم ١٦٠٠ دیلی سەلیبیەکان بەرەڵلا ئەکراو ٢٠٠ لیرەش بەسەرکردەکانیان ئەدرا .

بەڵام سەلیبیەکان گوێیان نەدایە تفاقنامەکەو قەڕاڵی ئینگلیز موسڵمانانی عەککای کۆکردەوە و لەدەرەوەی شار دا هەمووی کوشتن بەم جۆرە مودافەعەی عەککا بوە هۆی لەناو چوونی شەست هەزار موسڵمان .

لەپێش گرتنی عەککا دا نێوان قەڕاڵی فەرەنسا و قەڕاڵی ئینگلتەرە ، خراپ بوو ، وە نێوان مەلیك جۆی و مارکیزغونارديش لەسەر تەماحی تاجی فەلەستین تێك چوو بوو ، قەڕاڵ فلیب تەرەفداری غونارد بوو ، وە قەڕاڵ ڕیشاریش مەلیك جۆی حیمایە ئەکرد ، لەسەر هەندێ موعامەلەی حەقارەتی مەلیك ریشار ، قەڕاڵی فەرەنسا عادز بوو فەلەستینی بەجێ

هێشت و ڕۆیی .ئەم ناکۆکیەی نێوان سەرکردەکانی خاچ پەرست قوەتی فەرەنگی سست کرد و بەکەڵکی ئیسلام هات قەراڵی ئینگلیز لەدوای یەك مانگ ڕووی کردە یافا ، لەڕێگا لەژێر هێرش و پەلاماری لەشکری ئیسلامدا زیانێکی گیانی و ماڵی زۆریان دا . لەئەنجامدا قەراڵی ئینگلیز باش تێ گەیشت شەڕ کردن لەگەڵ سوڵتان سەلاحەدین بێ سوودە و ناچار داوای ئاشتی کرد ، سوڵتان مەلیك عادلی برای بۆ سوڵح بەموناسیب بینی مەلیك عادل و ریشار ، پێکەوە دانیشتن بەلاّم ئەنجامی نەبوو دوای ماوەیەك دیسانەوە قەراڵی ئینگلیز داوای ئاشتی کرد ، بەلاّم جاری دووەمیش ئەم سوڵحە سەری نەگرت ، تەنیا سود و قازانجی ئەم هاتوو چۆیە ئەوە بوو کە سوڵتان سەلاحەدین لەم فرسەتەدا شاری عەسقەلان و رەملەی ویران کرد و لەوناوەدا جێگەیەکی نەهێشت کە سەلیبیەکان بتوانن سودی لێ وەربگرن وە کە زستان هات بەسەرا ، سوڵتان چوە قودس و ، ریشار دیسانەوە داوای ئاشتی کرد ، بەلاّم لەم کاتەدا هەندێ ئاژاوە لەولاّتانی جزیرە دا ڕوویدا ، وە سوڵتان ناچار بوو لەشکرەکەی نارد بۆ جزیرە .

ریشار ویستی لەم فرسەتەدا سوود وەربگرێ و لەشکری کۆکردەوە و تا حصن الدارون چوو ، لەدوای خراپە و کوشتارێکی زۆر لە ئیسلامی ئەو ناوە دا ، ریشار لەترسی شکان و نەگرتنی قودس ویستی بگەڕێتەوە بەلاّم سەلیبیەکان بەقسەیان نەکرد و بەناچاری تا بەیت ونۆبە چوو ، بەرامبەر بەم هێرش و پەلاماری خاچ پەرستەکان سوڵتان سەلاحەدین خۆی ئامادە

کرد بوو ، هەرکانی و ئاوێکی سەر ڕێگەی دوژمن بوو هەمووی وێران کرد. ئەم کارە سەرکردەکانی سەلیبی بێزار کرد و لە کۆبوونەوەیەکدا بڕیاریان دا کەواز لە قودس بهێنن و بچنە سەر میسر . بەڵام لەپاشدا قەراڵ ریشار گەڕایەوە عەککاو کاغەزی بۆ سوڵتان نووسی سەرلەنوێ جاری چوارەم دیسان داوای ئاشتی کرد . لە ئەنجام هەردوولا رێککەوتن لە ۲۲ی مانگی شەعبانی ساڵی ۵۸۸ی کۆچی بەرامبەر ۲ی مانگی کانونی یەکەمی ساڵی ۱۱۹۲ی زایینی.

ئەمە ئەنجامی سێیەم سەفەر و هێرشی سەلیبیەکان بوو ئەم چەند سەد هەزار فیداییە و جەنگاوەرەی کە لە ئەورووپاوە وەکو لافاوێکی تەعەسوبی ڕووی کردبوە قودسی پیرۆز پێنج ساڵ بەرامبەر بە عەزم و خۆڕاگری سوڵتان سەلاحەدین هیچی پێ نەکراو لەئەنجام تەنیا دوو شاری قەراغ بەحری دەس کەوت و بەشی زۆری لەناو چوو ، وە بەشێکی کەمیشی دەرباز بوو و گەڕایەوە بۆ ئەورووپا .

وە سوود و قازانجی سوڵتان سەلاحەدین یش لەشەڕی فەلەستین و قودسدا ، وەکو نووسەری کتێبی حیات سەلاحەدین الایوبی ئەڵێ :

غەزای فەلەستین لە شەڕە گەورەکەی حطین ە وە دەسی پێکرد و لەو مێژوەدا بستێك لە خاکی فەلەستین بەدەس ئیسلامەوە نەبوو ، بەڵام لەدوای سوڵحی ڕەملە کە لە ۲۲ی شەعبانی ۵۸۸ی ك دا کرا هەموو فەلەستین جگە لە پارچەیەکی باریك لە صورەوە تا عەککا ، هەموو بوو

بە موڵکی سوڵتان ، خاچ پەرستەکان لەو هەموو ولاٌتانە دەرکران ، بیت المقدس سینرایەوە و شان و شەرەفی ئیسلام سەر لەنویٚ بەرزکرایەوە .

قەهرەمانی کورد و ئیسلام لەدوای سولّح چووە قودس ، ئیدارەی داخیلیەی رِیٚك خست و هەندیٚ قوتابخانە و خەستەخانەی تیا دروست کرد و لەپاشدا ویستی بچیٚ بۆ حەج ، بەلاٌم ئومەرای ئیسلام لەترسی غەدری فەرەنگ تکایان لیٚ کرد کە نەچیٚ و ئەویش دڵی نەشکاندن و لەپاش ماوەیەك لەگەڵ قوەتیٚکی بچوکی تایبەتی خۆی چوو بۆ ناوچەکانی ولاٌتانی ساحیلی و کەشفی قەلاٌکانی و لەپاشدا بەسەر نابلس و بیسان و کەوکەبدا چوە بەیروت و لەویٚ لەگەڵ ئەمیری ئەنتاکیە مولاقاتی کرد و لەدواییدا لە ٢٦ی شەوال ٥٨٨ی ك دا چووە دیمەشق .

## وەفاتی سوڵتان سەلاحەدین

سوڵتان ماوەیەك لەشام دا لەگەڵ رِیٚکخستنی ئیش و کاری ولاتەکەی خەریك بوو ، پاشان چوو بە پیر حەجاجەوە ، کە چاوی بە حاجیان کەوت زۆر عاجز بوو لە نەچوونی بۆ حەج گریا ، هەر ئەو شەوە لەرزی لیٚهات و رۆژ بەرۆژ نەخۆشیەکەی گرانتر بوو لە ئونجام رۆژی چوارشەممە ٢٧ی سەفەری ٥٨٩ ی کۆچی بەرامبەر ٤ی مارتی ١١٩٣ ی زایینی وەفاتی کرد .

تەمەنی ٥٧ ساڵ بوو ، بە بیٚ تەکلیف و هەرا نیٚژرا ، لە دوای سیٚ ساڵ ، مەلیك ئەفزەڵی کورِی لە نزیك مزگەوتی ئەمەوی ماڵی پیاویٚکی صالحی کرِی و بە حورمەتیٚکی زۆر لاشەی بەرِیٚزی گوازرایەوە ئەویٚ و سەر

لەنویٚ کفن ودفن کراو مەلیك ئەفزەڵ سیٚ رۆژ تازیەی بۆ دانا ، خەڵکیٚکی زۆر کۆبووەو دەنگی گریان و شیوەن ئەگەیشتە ئاسمان .

دکتور بیللی ئەڵیٚ : سولّتان وەفاتی کرد و بەم وەفاتە ئومەتی ئیسلام پادشایەکی زۆر بەهیٚزی لەدەس چوو کە لە بەلاٚیەکی وای رزگار کرد کە ئەوەندەی نەمابوو تووشی فەوتانیبکا ، سولّتان وەفاتی کرد دوژمنەکانیشی ئیقراریان بە گەورەیی کرد ، وە ئیقراریان کرد کە ئوستادیٚکی گەورەو عالمیٚکی زۆر زانا بوو .

سولّتان لە حالّی حەیاتیدا حەڤدە کورِ و کچی هەبوو کتاب الفتح القسی فی الفتح القدس .

لە میٚژووی ئەم قارەمانە کوردە باش تیٚگەیشتین کە لە رۆژی بوو بە وەزیری خەلیفە عاضد تا وەفاتی کرد چەند هەوڵی دا بۆ خزمەتی ئایینی پیرۆزی ئیسلام چۆن غەلەبەی بەسەر سەلیبیەکان و ئومەرای ئیسلام دا کرد و چۆن توانی دوو ولاٚتی وەکو سوریە و میسر کە بەهۆی جیاوازی مەزهەبی و تەماحی شەخسیەوە زۆر لەیەك جیابوون لەژیٚر حوکمی خۆیدا دامەزریٚنیٚ و لە کوردستانەوە تا سوریە و ، فەلەستین و ئەردەن و لوبنان و حیجاز و یەمەن و میسر و حەزرەمۆت و لیبیا و مەغریب و سودان و ، زۆر قەمی جیاجیا لەژیٚر نفوزی خۆیدا کۆکاتەوە و برایەتیان لەنیٚواندا بیٚنیٚتە وجود .

لەنیٚوان ئەم خەڵکانەدا کەس نەبوو بەدڵ سولّتانی خۆش نەویٚ و لەکاتی تەنگانەدا رۆحی خۆی بۆ فیدا نەکا ، بۆیە خۆشیان ئەویست

چونکە وەکو باوکێکی دڵسۆز و پادشایەکی عادل بوو ، بۆ نەفسی خۆی و بۆ ماڵی دنیا هەوڵی نەئەدا ، هەموو هەوڵ و تەقەلای بۆ مەسڵەحەتی ئیسلام بوو .

بەرامبەر بە خەڵك هیچ دەعیەی نەبوو ، هەمووکەس بەبێ زەحمەت ئەیتوانی بچێتە لای ، گەورە و بچووك لەمەقامی حەقدا یەك بوو ، کە دەنگی فەقیر و هەژاری ئەبیست چاوی پڕ ئەبوو لە فرمێسك و خەڵات و پارەی ئەدانێ ، یارمەتی مانگانەی ئەدا بە کوێر و هەتیوو پەککەوتە ، لەبەر زۆر بەخشین و دەس بڵاوی زۆر جار پارەی خەزێنەیان لێ ئەشاردەوە ، تالەکاتی تەنگانەدا بێ پارە نەمێنێنەوە ، لەدوای وەفاتی تەنیا چل و حەوت درهەمی لەپاش بەجێما کە میراتی سوالکەر و هەژاریش مومکینە لەوە زۆرتربێ .

لەساڵی ۱۳۱٦ی ك دا ، کە ئیمپراتۆری ئەڵمانیا سەردانی شامی کرد گوتی من ئێستا لە شارێکدام کە لەکاتی خۆیدا زاتێکی وای تیا ژیاوە کە هەرە گەورەی پیاوی سەردەمی خۆی بوو ، لە زانست و ئازاییدا بێ ئەمسال بوو شۆرەتی بەدنیا دا بڵاو بوو بۆوە و ئەو زاتەش قارەمانی کورد سەلاحەدینی ئەیوبی بوو .

نووسەری کتێبی حیاة صلاح الدین الایوبی ، ئەڵێ : جارێك سوڵتان هەڵی کوتایە سەر لەشکرێکی سەلیبیەکان و گوتی بوەستن دڵی ئەم شێرە لە دڵی شێری ئێوە بەهێزترە .

مەجلیسی سوڵتان زۆر پاك بوو کەس نەیئەوێرا غەیبەتی کەسێکی تر بکا ، سوڵتان ماڵ و منداڵی خۆی زۆر خۆش ئەویست ، زۆر جار لەگەڵ منداڵەکانیا یاری ئەکرد ، زۆر دیندار بوو عەدالەتی زۆر لەلا خۆشەویست بوو ، حەفتەی دووجار بەنەفسی خۆی بۆ بیستنی شکایەتی زۆرلێکراو دا ئەنیشت دەرگای بۆ گەورە و بچوك و فەقیر و دەوڵەمەند کرا بۆوە ، قەت هیلاکی و بێزاری نەئەزانی لە ئیشدا شارەزا بوو لە تەقدیر و لێکدانەوەی قوەتی دوژمندا زۆر وریا بوو ، کە بریاری بۆ کردنی ئیشێك بدایە لە کردنیدا هیچ دوودڵی نەئەکرد ، قەومی قبطی سوڵتانیان زۆر خۆش ئەویست چونکە حیمایەی ئەکردن بەڵگەی خۆشەویستیان ئەمەیە کە رەسمی سوڵتان سەلاحەدینیان لەتەنیشت ئەم کاسەی پیرۆزیان داناوە .

سوڵتان لەوەسیەت نامەکەیدا گوتی بۆ ئەمەی کەلەڕۆژی حەشردا شاهیدی غەزام بێ شیرەکەشم لەگەڵ بنێژن .[٢]

یەکەم قوتابخانە کە لەمیسر کرایەوە بۆ خوێندنی مەزهەبی شافعی بەناوی مەدرەسەی ناصریە ، سوڵتان دروستی کرد ، دوای ئەمە مەدرەسەی القمحیە بۆ مەزهەبی مالیکی و لە ٥٧٢ی ك دا ، مەدرەسەی الحنفیەی دروست کرد و لە جێگەی مەزهەبی شیعە ، مەزهەبی سوننی بلاوکردەوە .

---

٢ -هامەر جلد٤ ، ل٢٠٧ - تاریخی کورد ، ل١١٥ .

خاوەنی کتێبی صبح الاعشی ، ئەڵێ :

خانەقاو تەکیە لەپێش حوکومەتی ئەیوبی کورد لە میسر دا نەبوو ، موئەسیسی ئەمانە سوڵتان سەلاحەدین بوو ، یەکەم خانەقای صلاحیە بوو کە بەسەعید و سوعەدا ، ناسراوە ، دەسی پێ کرد و هەندێ ئەوقافیشی بۆ دانا . هەروەها ئەساسی قوەتی بەحری لەمیسردا لەتەرەف سوڵتان سەلاحەدینەوە دانراو بەعینوانی دیوان الاستول ، دائیرەیەکی تایبەت لەژێر چاودێری مەلیك عادلی برایدا بۆ دامەزراند ، ئەسکەندەریە و دمیات لەقەراغ بەحری سپی ، وە فستات و قوص لەسەر نیل ، بەندەری بەحریی موهیم بوون ، زۆر مزگەوت و قوتابخانەو خەستەخانەو غەریب خانە و پرد و جۆگە و قەلاّو شوورەی لەمیسردا دروست کرد ، شوورێکی مەحکەمیشی بەدەوری پایتەختی میسردا ، دروست کرد . لەشام و ولاّتانی تریش بەهەمان شێوە خزمەتی ئەکرد . ڕەسمی گومرگی لەسەر توجار زوراع هەڵگرت و ڕەسمی لەسەر حەجاج هەڵگرت و لەدەوری حکومەتی فاتیمیدا خەڵکی میسر لەژێر باری گرانی ئەم ڕەسمەدا بەتەواوی پشتی چەما بووە لەم ڕووەوە زۆری زوڵم لێ ئەکرا .

الفضل قازی کەوەزیری سوڵتان بوو لەکاری چاك زۆر یارمەتی سوڵتانی ئەدا ، مەجلیسی شورای حکومەتی ئەیوبی تەنیا قەرەقوش و حسام الدین و مەشتوب و ئەمسالی نەبوو ، وەکو قازی و کاتب عیمادالدین و عیسی الهکاری و هەندێ عولەمای بەشۆرەتیشی تیا بوو .

# کوڕانی سوڵتان سەلاحەدین

سوڵتان کە ئەم وڵاتانەی هێنایە ژێر حکمی خۆی و لەپێش وەفاتیدا ، فەلەستین و سوریەی دا بە مەلیك ئەفزەل و میسری دا بە مەلیك عزیـز و حەلەبیشی دا بە مەلیك زاهیر غازی غیاث الدین ، دیـارە کوڕەکانی زۆر نازناویان هەبووە .

بەشێکی جزیـرەی دا بـە مـەلیك عـادلی بـرای و کوڕانـی شـێرکۆی مامیشی لە حمص دا جێگیر بوون و یەمەنیش دا بەکوڕانی سەیف الاسـلام طفتەکین ی برای ، سوڵتان کەسی نەکرد بوو بە جێگر لەدوای خۆی لەبـەر ئەوە کوڕەکانی هەرکەسە لە جێگەی خـۆی ئیـدارەی حکومـەتیان کـرد و نزیکی ساڵێك تابیعیەتی مەلیك ئەفضل یان پاراسـت . مـەلیك ئـەفزەڵ کورە گەورەی سوڵتان سەلاحەدین بوو ، لـەدوای بـاوکی بـوو بـە گـەورەی سەرجەم وڵاتانی ئەیوبی ، ضیاء الدین ابـن اسـیر ، بـرای مێـژوو نووسـی ناسراو ئیبنو ئەسیر ، وەزیری مەلیك ئەفزەڵ بوو ، لەڕووی ئەم وەزیـرە بـێ ئیدارەو تەدبیرەوە ، ئیدارە زۆر تێك چوو ، بەهۆی ئەمـە ئومـەرای دیـار و ناسراوی سەردەمی سوڵتان سـەلاحەدین زوو لەبـەرچاوی مـەلیك ئـەفزەڵ کەوتن و لەسەر کار لابران ، لەبەر ئەمە هـەموویان عـادز بـوون و یـەك لەدوای یەك سوریەیان بەجێ هێشت و چوونە میسر لای مـەلیك عـەزیز ، زۆری پێ نەچوو مەلیك عەزیز سەر بەخۆیی میسری ڕاگـەیاند و لـە ٥٩٠ ك دا ، بۆ زەوت کردنی موڵکی براکەی بەلەشکرەوە ڕووی کردە سوریە .

ئاژاوەی نێوان ئەم دووبرایە بەناوبژی مەلیك عادل و هەندێ ئومەرای ئەیوبی ئەمجارە کۆتایی هات . بەلاّم ساڵی دوایی مەلیك عەزیز دیسانەوە هاتە سەر شام ، ئەمجارە مەلیك عادل یارمەتی مەلیك ئەفزەڵی داو لەئەنجام مەلیك عەزیز گەڕایەوە میسر ، مەلیك عادل لەسەرەتاوە تەرەفداری ڕێك کەوتنی برازاکانی بوو بەلاّم لەدواییدا کە تەماشای بێ ئیدارەیی کردن زانی کەڕەنجی سوڵتان سەلاحەدین لەڕووی کوڕەکانیەوە مومکینە بە باد بچێ و ولاّتانی ئەیوبی تووشی نشوستی و بێ هێزی ببێ ویستی ئیدارەی دەوڵەتی ئەیوبی بگرێتە ژێر دەسی خۆی و ئەوە بوو لەدوای شەڕ و دەعوا لە ٥٩٢ ك دا ، شام لە مەلیك ئەفزەڵ زەوت کراو مەلیك ئەفزەڵ بەناچاری بەقەلاّی ساخد ، ڕازی بوو ، سوریە بەناوی تابیعی زاهیریی میسر کەوتە دەس مەلیك عادل .

مەلیك عادل لەدوای ساخ کردنەوەی سوریە بۆ خۆی ئیدارەی جزیرەشی دامەزراند ، لەدوای وەفاتی مەلیك عەزیز لە ٥٩٥ ك گەڕایەوە سوریە و لەپاشدا مەلیك عادل بەلەشکرێکەوە ڕووی کردە میسر و ئەویشی هێنایە ژێر حوکم و دەوڵەتی خۆی ڕاگەیاند .

کوڕانی سوڵتان سەلاحەدین مەلیك ئەفزەل ، لەقەلاّی ساخەد و مەلیك زاهیر لەحەلەب ، هەردووك بەلەشکرەوە ڕوویان کردە شام بەلاّم مەلیك عادل بەفریادا گەیشت و ئیتر وازیان لە موحاسەرە هێنا و گەڕانەوە شوێنی خۆیان ، دوای ئەمە مەلیك ئەفزەڵ قەلاّی سمسادی تەعمیر کرد و خۆی بە تابیعێکی سەلجوقی ڕۆم ئیعلان کرد و کە مەلیك زاهیری

برای وەفاتی کرد بەیارمەتی کیکاوس ی حوکمداری سەلجوقی ڕۆم ویستی حەلەب بگرێ و حکومەتێکی بۆ خۆی پێکبەوەبنێ بەلام ئەم هەوڵەش سەری نەگرت و گەڕایەوە قەلاَی سمساد ، تا دواین تەمەنی لەوێدا ژیاو لە ٦٢٢ك دا وەفاتی کرد .

## دەوری سەڵتەنەتی مەلیك عادل

مەلیك عادل برای سوڵتان سەلاحەدین لە ١٦ی ربیع الاخری ٥٩٦ك لە قاهیرە دەوڵەتی سەربەخۆیی ڕاگەیاند ، بەشێوەیەکی ماهیرانە وڵاتی سوڵتان سەلاحەدینی بەتەواوی بێجگە لە حەلەب هێنایە ژێر حوکمی خۆی لەڕووی ئیدارەوە لەسەر شوێنی کاکی ڕۆیشت و ئیدارەی وڵاتی بەناوی خۆیەوە دایە دەس کوڕەکانی و ، مەلیك کاملی بەسەر سوریە و مەلیك ئەشرەف موسای ، بەسەر جزیرەوە دانا ، وە هەندێ لە کوڕەکانی تریشی کرد بە حاکمی جێگایەکانی ترو تابیعی براکانی بوون لە دەوری حکومەتی مەلیك عادل دا ، لەشکرێکی سەلیبیەکانی هاتە سەر بەیروت و گرتی ، ئەم هێرشە لەکاتی شەڕ و هەرای بەینی کوڕانی سوڵتان سەلاحەدین بوو ، مەلیك عادل لەدوای هاتنە سەر تەختی بەلەشکرێکەوە چوو شاری یافەی گرت ، خاچ پەرست یش تیبنین یان موحاسەرەکرد بەلام بۆیان نەگیراو داوای سوڵحیان کرد و تفاقنامەیەکی سێ ساڵی لەبەیندا مۆرکرا و ، فەرتەنەی سەلیبی چواردم بەم جۆرە بڕایەوە .

دوای ئەمە کە لە ٦١٣ك دا مەلیك زاهیر غازی حاکمی حەلەب وەفاتی کرد و ، دوای ئەو مەلیك ئەفزەڵ لە ٦٢٢ك دا ، وەفاتی کرد و ،

هەرای سەلیبی چوارەم بڕایەوە و ، ئیدارەی کوڕانی قارەمانی گەورە دوایی هات .

پاپا اینوسانی سێ یەم ، لە ۱۲۱٦ - ۱۲۱۷ز دا فەرتەنەی ئەهلی سەلیبی پێنجەمی دروست کرد ، قەڕاڵی مەجارو ، دوقەکانی ئاوستریاو ، باویرا ، لەگەڵ ئومەرای ئەڵمانیای باشوور هەموو داخیلی ئەم قافلەی پێنجەم بوون ، وە لەشکرێکی ۲٥۰۰۰۰ دووسەد و پەنجا هەزار کەسی زۆری ئەڵمان بوو ، ڕووی کردە ساحیلی سوریە و لەبەحر هاتنە دەرەوە و تەرەفی عەککایان تالاّن و وێران کرد و لەگەڵ گەورەکانی سوریە شدا کەوتنە شەڕەوە ، دوای ئەمە بڕیاریان دا کە بچنە سەر میسر و لەنیل هاتنە دەرەوە و دەوری شاری دمیات یان دا ، مەلیك عادل لەوبەینەدا لە باکووری سوریە بوو کە خەبەری دمیاتی بیست بەپەلە لەشکری کۆکردەوە و ڕووی کردە شام بەلاّم ئەجەل ماوەی نەداو لەنزیك شام لە عەلاکین دا ، وەفاتی کرد لە مانگی جیماد الاخری ساڵی ٦١٥ك .

مەلیك عادل قارەمانێکی زۆر ئازاو بەجەرگ بوو لەشەردا بەعقل و کەماڵی لە ئیدارە و سیاسەتدا لەسەردەمی کاکیا دەسەڕاستی بوو چ لە زەمانی کاکی و چ لەدەوری حکومەتی خۆیدا جیهادێکی زۆری لەگەڵ سەلیبیەکان کرد لەگەڵ ئەمەشدا لەگەڵ قەڕاڵی ئینگلیز ڕیشاری شێر دڵ دا زۆر دۆستایەتی هەبوو ، ئەم قەڕاڵە لە موخابەرە و گفتوگۆدا ، خۆشەویست و برام ی پێ ئەگوت ، لەسکەدا عینوانی ئەبو الفیدای

وەرگرتبوو لەسەردەمی خۆیدا شەرکەتی حکومەتی ئەیوبی بەتەواوی پاراست .

## دەوری سەڵتەنەتی مەلیك کامل

عینوانی ناسر الدین و نازناوی ئەبو المعالی محمدە و کوڕی مەلیك عادلە لە مانگی ربیع الاولی ٥٧٦ك دا هاتۆتە دنیاوە ، لەدوای وەفاتی باوکی بوو بە حوکمداری میسر ، وە دەرکردنی ئەهلی سەلیب لە دەوری دمیات و خاکی میسر کەوتە عۆدەی ئەو ، لەم کاتەدا مەلیك عیسی شەرف الدین مەلیکی سوریە بوو ، وە مەلیك الاشرەف موسی مزەفەرالدین یش مەلیکی حەلەب بوو ، ئۆردووی سەلیبیەکان ماوەیەکی زۆر شاری دمیاتی موحاسەرەکرد ، بەلاّم هەردوولا لەبەر نەخۆشی و برسیەتی زیانێکی زۆریان پێ گەیشت لەدوای ساڵ و نیوێك موحاسەرە و شەڕ ئینجا دمیات کەوتە دەس سەلیبیەکان ، لەسەرەتای ئەم شەڕە خەڵکی دمیات حەفتا هەزار کەسێك بوو بەلاّم لەکاتی تەسلیم بوونیاندا تەنیا سێ هەزار کەسێك مابوو ، ئەوانیش لەتەرەف سەلیبیەکانەوە هەموویان شەهید کران ، سەلیبیەکان لەدوای گرتنی دمیات ڕوویان کردە قاهیرە ، مەلیك کامل هەرچەندە لەتەرەف لەشکری براکانیەوە تەقویە کرابوو ، بەلاّم دیسانەوە بەنیسبەت لەشکری سەلیبیەکان زۆر کەم بوو بەریەستی هێرشەکی پێ نەکراو ، وەعدی ڕەتکردنەوەی فەلەستینی دانێ بەمەرجێك واز لە دمیات بهێنن خاچ پەرست قبوڵ یان نەکرد .

دوای ئەمە مەلیك کامیل بڕیاری دا هەموو سەدەکانیان شـکاند و ، ئارازی دەڵتا غەرق کراو ، خەتی گەڕانەوەی خـاچ پەرسـت بـڕاو ، تووشـی برسیەتی بوون ، لەلایەکی تریشەوە لەشـکری ئیسـلام لێیـان کەوتبوونـە هجوم و لەسەر ئەمە خـاچ پەرسـت داوای سـوڵحیان کـرد ، بەومەرجـەی ڕێگـەی گەڕانـەوەیان پـێ بـدرێ و ڕێگـەی زیـارەتی حـەجاجیان بـدرێ و سوڵحیان کرد و ڕۆیشتن .

لەدوای ئەمە کە هەرای سـەلیبی شەشـەم بڕایـەوە ، ئـەوەندەی پـێ نەچوو لەناو کوڕانی مەلیك عادل دا ، شەڕی خۆماڵی دروست بوو .

مەلیك عیسی مەلیکی سوریە لە کاکی وەرگەڕاو چاوی بڕیە تـەختی میسر و خەریك بوو لەگەڵ جەلالەدین خوارزەمشادا ، تفـاق بکـا لـە دژی برای خۆی ، مەلیك کامل کە ئەمەی بیست سەغلەت بـوو ، لـەم کاتـەدا ئیمپراتۆری ئەڵمانیا فرەدریقی دووەم ، بەلەشکرێکی گـەورە ڕووی کردبـوە میسر ، مەلیك کامل ناچار بوو لەگەڵ ئیمپراتۆر ئاشتی بکا ، وە هەرلـەم کاتەدا مەلیکی سوریە عیسی وەفاتی کرد لە مـانگی ذي العقـدە سـاڵی ٦٢٤ك دا ، وە مەلیك ناسر داودی کوڕی بوو بە مەلیکی سـوریە مـەلیك کامل بەلەشکرەوە ڕووی کردە شام و لەولاوە مەلیك ئەشرەفی برای ویسـتی یارمـەتی مـەلیك ناسـر بـدا ، بـەلاّم لـەدواییدا لەگـەڵ مـەلیك کـامل ڕێککەوت و بەیەکەوە شامیان گرت و مەلیك کامل بەرامبەر بە هـەندێك ناوچەی جزیرە شامی دا بەمەلیك ئەشرەف لەسـاڵی ٦٢٦ك ، وە کـەرەگ و ئەشواك و هەندێ قەڵای تریش لەباتی شام ، درا بە مەلیك ناسرداود .

مەلیك كامل لەدوای جێ بەجێ کردنی ئیشوكاری سوریە ، ڕووی کردە جزیرە و مەزۆپۆتامیا ، وە بۆ بەربەست کردنی لافاوی خوارزەمی و مەغۆل ، ئەم وڵاتەی ڕێکخست و ، مەلیك نجم الدین ئەیوبی کوڕە گەورەی خۆی بەسەر جزیرەوە دانا ، لەدوای ماوەیەك مەلیك نجم الدین ئەیوب توانی لەشکری بێ ساحێبی خوارزەمی بگرێتە ژێر دەسی خۆی تا بتوانێ بەرامبەر لافاوی هۆلاکۆی مەغۆل بوەستێ .

لەلایەکی تریشەوە تفاقنامەی نێوان مەلیك كامل و ئیمپراتۆری ئەڵمانیا دوایی هات کە ماوەکەی دەساڵ و شەش مانگ و دە ڕۆژ بوو ، بەگوێرەی ئەم تفاقنامە قودسی شەریف لەگەڵ ناسرە و ئەترافی و لەعەککاوە تا یافە ، پارچەیەکی ساحلیش ، بە مۆقەتی کەوتە دەس ئیمپراتۆری ئەڵمان ، بەرامبەر بەمە تاماوەی دەساڵ و شەش مانگ و دەرۆژ ، واز لە شەڕ هێنرا ، وە بەپێی ئەم بەرنامەیە ئەبوایە ئیمپراتۆر یارمەتی مەلیك كاملی بدایە خولاسە ئەم موعاهەدەیە نەموسڵمان و نەگاوری مەمنون نەکرد ، وە ئیمپراتۆریش زۆری پێ نەچوو فەلەستینی بەجێ هێشت و چوەوە بۆ ئەڵمانیا ، لەدوای ئەمە زۆری پێ نەچوو کە بینی مەلیك كامل و مەلیك ئەشرەفی برای لەگەڵ سوڵتانی ڕ{م تێك چوو ، سوڵتان کەیقوبادی سەلجوقی لەشکری کردە سەر باکووری جزیرە لەساڵی ٦٣١ك و لەگەڵ لەشکری ئەیوبیدا کەوتە شەڕەوە ، لەئەنجام هەندێ جێگەیان لە موڵکی ئەیوبی داگیر کرد ، بەڵام پێیان نەپاراسترا ،لەئەنجام

ئەم شەڕە بەمردنی سوڵتان کە یقوباد برایەوە لەشکری سەلجوقی لـــەخاکی ئەیوبی دەرکرا لەساڵی ٦٣٣ك .

دوای ئەمە بەینی مــەلیك کــامل و مــەلیك ئەشـرەفیش تێکچـوو ، مەلیك ئەشرەف لەگەڵ ژمارەیەك لەسەرکردەکانی ئەیوبی تفاقیان کرد لـە دژی مەلیك کامل ، لەسەر ئەمە مەلیك کامل بەلەشکری میسرەوە ڕووی کردە شام ، بەڵام پێش ئەوەی بگاتە شام مەلیك ئەشـــرەف لەشـام وەفـاتی کرد لە ٤ی محرم ٦٣٥ك ، وە شام بەبێ شەڕ کەوتە دەســت مــەلیك کـامل بەڵام بەرامبەر بە تەسلیم کردنی ئەم وڵاتە ، شاری بەعلەبەك و بصــری دا بە مەلیك صالح ئیسماعیلی برای مەلیك کامل لەدوای ئــەم غەلەبەیـە ، بەچەند مانگێك لەدیمەشق وەفاتی کرد لە ٢١ی ڕەجەبی ٦٣٥ك . مــەلیك کامل بێ گومان حوکمدارێکی زۆر باش بوو چ لە مەیدانی شـەڕداو چ لـە ئومـوری سیاسـیدا ، لەسـەر شـوێنی بـاوك و مـامی ڕۆیشـت ، وەفـاتی ئەونوشوستی حوکمەتی ئەیوبییە .

## مەلیك عادلی دووەم

لەدواتی وەفاتی مەلیك کـامل ئومـەرای ئـەیوبی ، مـەلیك عـادلی دووەمیان کە کوڕە بچوکی مەلیك کامل بوو ، بەسوڵتان ئیعلان کرد .

ئـەم شـازادەیە چ لەبـەر بچوکـی و چ لەبـەر بێکـارەیی قابلیـــەتی حکومداری نەبوو ، لەم ڕووە مەلیك نجم الدين برای گەورە و بەتواناتر بـوو ، کەلەم کاتەدا حاکمی جزیرە بوو ، لە کاتێکدا کــە لەگـەڵ موحاسـەرەی شاری ڕەها خەریك بوو ، خەبەری وەفاتی باوکی زانی و وازی لە موحاسـەرە

هێنا و لەوەدا بوو کە بێ بۆ سوریە ، بەلاّم لەپڕێکا تووشی ئاژاوەی خوارزەمیە کانی مەعیەتی بوو ، ویستیان بیگرن بەلاّم خۆی گەیاندە سنجار و ڕزگار بوو .

بدر الدین لۆلۆی مەلیکی موسڵ کە دوژمنی مەلیك نجم الدین بوو ، لەم فرسەتەدا ویستی لە سنجاردا مەحوی بکاتەوە و موحاسەرەی کرد ، بەلاّم قازیە عاقڵەکەی مەلیك نجم الدین خوارزەمیەکانی لەگەڵ ئاشت کردەوە و بەیارمەتی ئەو لەشکری بدرالدین لۆلۆی زۆر خراپ شکاند و لەوێوە ڕووی کردە دیار بکر و سوڵتانی ڕۆم یشی لەدەوری ئەم قەلاّیەدا شکان و ولاّتانی جزیرەی دیسانەوە هێنایەوە ژێر حوکمی خۆی .

لەساڵی ٦٣٦ك دا ، مەلیك جواد یونس ، داوای گۆڕینەوەی سنجار و رەقەوعانەی لەگەڵ شام لە مەلیك نجم الدین کرد ، ئەویش قبوڵی کرد تورانشای کوڕی بەسەر جزیرەوە بەجێ هێشت و حەران و ڕەها هەندێ جێگەی تریشی دا بە ئومەرای خوارزەمی و ، بەلەشکرێکەوە ڕووی کردە سوریە و شامی گرت .

لەساڵی ٦٣٧ك دا ، مەلیك نجم الدین لەگەڵ هەندێ سەرکردەی تر بۆ زەوت کردنی میسر بەپێنج هەزار کەسێکەوە لەشام هەڵسا و چوو بۆ نابلس و ویستی بزانێ مەلیك ئیسماعیلی مامی بەڕاستی یارمەتی ئەدا یان نا ، لەئەنجام مەلیك داودی کەڕەگ کە ئەمەی بیست بەلەشکرەوە هاتە سەر نابلس و مەلیك نجم الدینی گرت و ناردیە کەرەگ . لەپاشدا مەلیك نجم الدین و مەلیك داود ڕێك کەوتن و لەسەر ئەمە کە میسر بۆ مەلیك

نجم الدین و سوریە و هەندێ شوێنی تریش بۆ مەلیك داود، کە مەلیك عادل ئەم خەبەرەی بیست دەس بەجێ فەرمانی دا بەمەلیك ئیسماعیلی مامی ، کە بچێتە سەر ئەو دوومەلیکە و ، خۆشی بەلەشکری میسرەوە لە بلبایس ئۆردووگای دامەزراند ، لەئەنجام بەشێکی لەشکری مەملوك لە مەلیك عادل ڕازی نەبوون و لە ئۆردووگادا گرتیان و لە سوڵتانیان خست و لە قەلاّی قاهیرە حەپسیان کرد .

لەدوای چەند ڕۆژێك مەلیك نجم الدین یان کرد بە مەلیکی میسر ، وە مەلیك عادل ئەبو بەکریش تا ساڵی ٦٤٥ك حەپس بوو ، وە لەم تاریخە دا ئیعدام کرا .

## مەلیك صالح نجم الدین ئەیوب

کوڕە گەورەی مەلیك کاملە ، لەدوای دابەزاندن و حەبس کردنی مەلیك عادل ئەبو بەکر لەتەرەف بەشێکی لەشکری مەملوکی میسرەوە ، مەلیك نجم الدین ئەیوب ، بانگ کرایە میسر و لەوێ کرا بە سوڵتان ، لەساڵی ٦٣٧ك ، لەتەرەف خەلیفەی بەغدا شەوە پەسەند کرا .

بەلاّم لەدوای ساڵێك لەگەڵ دوژمنانی خۆماڵیدا تێك چوو ، مەلیك داود و مەلیك نجم الدین ئیسماعیلی مامی کە حاکمی شام بوو لەدژی سوڵتان صالح لەگەڵ سەلیبییەکانی میسر ڕێك کەوتن بۆ لەناو بردنی سوڵتان صالح نجم الدین ئەیوب ، لەمولّکی ڕزگارکراوی سوڵتان سەلاحەدین ، تەبەریەو شەقیف و ئەرنون و سەقدیشیان ، دا بەفەرەنگ خولاسە لەبەینی ئەم ئومەرای حەسود و تەماحکاری ئەیوبی و فەرەنگ دا

، ئەم تفاقنامـه کرا بۆ لەناوبردنی سوڵتان ، ئـەم فەسادەش مـەلیك نجـم الدین ئیسماعیلی مامی سوڵتان بوو .

لەدوای ماوەیەك لەشکری فەرەنگ و داود و ئیسـماعیل بەیەکـەوە و ڕوویان کردە لەشکری سوڵتان نجم الدین و لەنێوان شاری غەزەو عەسقەلان دا ، تووشـیان بـوون و شـەڕێکی قـورس قـەوما و لـە ئـەنجامدا خـائن و فەرەنگ زۆر خراپ شکان و لە فەرەنگ زۆر بـەدیل گـیران و ناچـار بـوون لەگەڵ سوڵتانی میسردا سوڵحیان کـرد و لەشـکری میسر بەسـەربەرزی گەڕایەوە . بەڵام ئەم دوو مەلیکە واتە : داود و ئیسـماعیل لـە ئـەنجامدا تفاقنامـەیـەکی ڕەسمیـان لەگـەڵ فـەرەنگدا ئیمـزا کـرد و بەشـی زۆری فەلەستین و قودس و هەندێ جێگەی تریشیان بۆ تەرك کردن .[٣]

ئیتر ئەم شەڕ و ئاژاوە ، هەر بەردەوام بوو تا هاتنی لافـاوی لەشـکری قەڕاڵی فرانسس لوئیی حەوتەم ، ئەهلی سەلیبی حەوتەم ، ڕوویـان کـردە شاری دمیات و گرتیان ، سوڵتان لەم کاتەدا تووشی نەخۆشی یەکی گـران بوو پاشان لە ١٥ی شەعبانی ساڵی ٦٤٧ك دا وەفاتی کرد . ئەم حوکمدارە حوکمەتێکی بەشەوکەتی وەکو حوکومەتی سوڵتان سـەلاحەدین و مـەلیك کاملی باوکی دامەزراند ، بەڵام خزمەکانی خۆی بوون بە کۆسـپ و ڕێگـر لەپێشیدا .

---

[٣] - قودس لەساڵی ٤٩٢ك دا ، کەوتە دەس فەرەنگ و ٩٠٠٠٠ کەسێکیان کوشت و لە ساڵی ٥٨٣ك دا ، کەوتە دەس سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبی .

# دەوری سەڵتەنەتی تورنشا

تورانشا کوڕی مەلیك صالح نجم الدین ئەیوب ە ، لەکاتی وەفاتی باوکی مەلیکی جزیرە و کوردستان بوو ، هەر لەسەردەمی باوکی لەشەڕ و شۆڕی بدر الدین لۆلۆی ئەتابەگ زەنگی موصل و سولڵتانی سەلجوقی ڕۆمدا لە ئیشوکاری سەرداری ئیدارەدا پێگەیشتبوو ، کە خەبەری وەفاتی باوکی بیست دەسبەجێ هەڵسا و ڕووی کردە میسر ، شەجەرە الدوری باوەژنی ژنێکی تێگەیشتوو و عاقڵ بوو تا تورانشا گەیشتە میسر ، مردنی مەلیك نجم الدینی شاردەوە تورانشا کە گەیشتە میسر ، دەسبەجێ لەتەرەف سەرکردەکانەوە دەنگی پێ دراو کرا بە سولڵتان ، تا ئەو کاتە لەشکری سەلیبی شاری دمیاتی گرت بوو وە لەشکری ئینگلیز و فەرەنسا ، ڕووی کرد بوە پایتەختی میسر ، وە هەروەها لەشکرێکی زۆری ئەڵمانیش هاتبوو بە ئیمدادی سەلیبیەکانەوە ، گەیشتبوە مەنسورە و موحاسەرەی کرد بوو ، تورانشا لەدوای گەیشتنی بە میسر لەگەڵ کۆکردنەوەی لەشکر و تەئمینی مودافەعە خەریك بوو ، لەشکرێکی باشی کۆکردەوە و ، مەنسورەی باش قایم کرد و ، بڕیاری دا پردەکانی نێوان مەنسورە و قاهیرەی تێکدا و سەدەکانی شکێنراو ، لافاوی ئاو لە هەموو لایەکەوە دەوری ئۆردوگای سەلیبی داو خەتی گەڕانەوەی بڕین و ، لەلایەکی تریشەوە لەشکری تورانشا لە هەموو لاوە تەنگیان بە سەلیبەکان هەڵچنی و هاتوو چۆیانی لەگەڵ شاری دمیات بڕی و تووشی نەخۆشیەکی خراپی کردن .

لەئەنجام سەرداری لەشکری سەلیبی لەگەڵ ئۆردوەکەیدا مەجبوری گەڕانەوە کرد و لەم گەڕانەوەیەدا لەشکری میسر زۆریان لێ کوشتن و تەنگیان پێ هەڵچنین و زۆریان بەدیل گرتن لە ساڵی ٦٤٧ك .

قەڕاڵی فەرەنسا گیراو ، سن لۆ ، بەوبەیاخەوە کەلە مناستری سن دەنیس وەری گرتبوو ، کەوتە دەس سولتان تورانشا و لەدوای دانی سەرانەیەکی ٨٠٠ ٠٠٠ ئالتوونی و تەسلیم کردنی شاری دمیات و دەسبەجێ لەخاکی میسر بچێتە دەرەوە و ، هەمووی بەجێ هێناو گەڕایەوە ، زیانی سەلیبیەکان لەم شەڕەدا نزیکەی ٣٠ ٠٠٠ سی هەزار کەسێك بوو ، جگە لە زیانی ماڵی معالم تاریخ العصور الوسطی ، لەدوا بڕانەوە هەرای سەلیبیەکان تورانشا خەریکی دامەزراندنی زەبت و رەبتێکی عەسکەری لەناو لەشکری مەملوکدا بوو ، تورانشا بەلەشکری جزیرەی پشت ئەستوور بوو ، ویستی لەشکری مەملوکی بەحری بهێنێتە ژێر زەبت و رەبتەوە ، ئەم فیکری سولتان بۆ لەشکری عەبدانی لە ئیتاعە دەرچوو ، دەسی نەداو رۆژێك لە غافلەتەوە کوشتیان ٦٤٨ك . تورانشا دواین سولتانی بەشەوکەتی ئەیوبی بوو ، هەندێ لە مێژوونووسان ئەڵێن ، ئەم تاوانە گەورەیە ، دەسی شجرة الدری باوەژنی تیابوو ، چونکە تورانشای خۆش نەئەویست و لەگەڵ بەرپرسی تاوانبارەکانیش زۆر رێك بوو ، دوای ئەمە شووی کرد بە قوماندانی مەملوکی بەحری کە ئیبیك بوو . ئەم مەملوکانە سەربازی تایبەتی سولتان نجم الدین ئەیوب بوون و مەملوکی بەحری یان پێ ئەگۆتن ، هەموویان عەبدی بە پارە کڕاوی چەرکەس بوون

، لەقەد نیلداو لە جزیرەی ڕوچــە دا قشـڵەیەکی تایبــەتیان هــەبوو ، لــە زەمانی سوڵتانی مەملوك قلاَون دا ، سنفێکی تــر لەوانــە دروست کـراو ناویان نرا برجی ، چونکە لــە بورجــەکانی ئیــچ قــەڵای قاهــیرە دا بــوون ، لەپاشدا ئەم مەملوکانە بوون بــە دوو بــەش ، بەشـی یەکــەم لــە ساڵی ٦٤٨ك تــا ٧٩٢ك میســر و ســوریەی هێنــا یــە ژێــر حوکمـــــی خــۆی و سەڵتەنەتی ئەیوبی ڕوخاند لە میسر .

بەشی دووەمیش سەڵتەنەتی مەملوکی بەحری لەناو بــرد ، تــا دەوری یاوەز سوڵتان سەلیمی عوسمانی دەوامی کرد لە ٧٩٢ك تا ٩٢٢ك .

## دوایی حوکومەتی ئەیوبی لە میسر

### ٥٦٧ - ٦٥٢ك

مەملوکی بەحری میسر لەدوای شەهیدکردنی تورانشا ، شەجەرەت و دوڕی باوەژنیان کرد بە مەلیکەی میسر ، خوتبەیان بەناویەوە خوێنــدەوە و سکەشیان بەناویەوە لێدا ، ناوونیشانی سکەی المستعصمیة الصالحة الملکـة المسلمین ، ام ملك المنصــور خلیــل بــوو دوای ئیعلانــی مەلیکــە ، ئیبیــك ســەرکردەی مــەملوکی بــەحری کــرا بــە قومــاندانی ئــــۆردووی میســـر سەڵتەنەتی شجرة الدر زۆر دەوامی نەکرد ، چونکە ســەرکردەکانی میســر سوور بوون لەسەردانانی حوکمدارێك لــە خانــەدانی ئــەیوبی کــورد ، لــە ئەنجام مەلیك ئەشرەف موسی خوارزای مــەلیك کــامل و کــوڕەزای دوایــن مەلیکی ئەیوبی یەمەن لە جێگەی شجرة الدر ، کرا بەمەلیکی میســـر ، لەساڵی ٦٤٨ك .

بەلاّم حوکم و نفوز بەدەس ئەمیر ئیبیکــی مـەملوك بـوو ، لەئـەنجام ئەمیری مەملوکی بەحری و قوماندانی لەشکری میسر ئیبیــك ، لەسـاڵی ٦٥٣ك دا ، حوکمداری سەربەخۆی خۆی بەسەر میسردا ڕاگەیاند و مەلیك ئەشرەفی دابەزاند و ناردیەوە یەمەن ، لای خزمەکانی بەجۆرە ســەڵتەنەتی بەشەوکەتی ئەیوبی لەمیسر کۆتایی هـات و ، کەوتــە دەس عــەبدەکانیان بەلاّم لە شوێنەکانی تر حوکمیان هەر بەردەوام بوو . حوکومــەتی ئـەیوبی میسر ٩٥ ساڵی دەوام کرد .

## حکومەتی ئەیوبی حەلەب

٥٧٩ - ٦٥٨ك

سوڵتان سەلاحەدین یەکەم جار ولاّتـی حەلـەبی دابـە مـەلیك زاهـیر غازی کوڕی ، کە هێشتا تەمەنی یازدە ساڵ بوو ، لەدوای چـەند مـانگێك ئیدارەی ئەم ولاّتەی دا بە مەلیك عادلی برای لە ٥٨٢ك دا ســوڵتان سـەر لەنوێ تەقسیماتی موڵکـی کـرد و مـەلیك عـادلی نـاردە سـەر جزیـرە و مەلیك عەزیزی کوڕی لەمیسر و ولاّتی حەلەبی دیسانەوە دا بــە مــەلیك زاهیری غازی کوڕی و ( زەعیفە خاتوون )ی کچی مەلیك عادلی برای خۆی لە مەلیك زاهیر مارە کرد ، مــەلیك زاهـیر لـە ٦١٣ك دا وەفـاتی کـرد ، لەپێش وەفاتیدا مەلیك عەزیز مەحمودی کورە بچوکی کردبووی بە جێگری خۆی و بەلاّم تا ئەوکوڕە گەورە بـوو ئیـدارەی دەوڵـەتی حەلـەب ، بـەدەس ئەتابەگ تفرەلی نائیبی مەلیك زاهیر و قازی بهاو الدیـن کـوڕی شـەدادەوە

بوو ، مەلیك عەزیز لە سالّی ٦٢٨ك ئیدارەی حوکومەتی حەلــەبی گرتــە دەس خۆی و تا سالّی ٦٣٤ك وەفاتی کرد و مەقامی حوکومەتی بۆ مەلیك ناسر یوسفی دووەمی کوڕی بەجێ هێشت کە هێشتا حــەوت ساڵە بــوو ، نەنکی یوسف ، کەناوی زەعیفە خاتوون بوو ژنێکی زۆر سیاســی بــوو لــە ڕووی ئیــداری و عەســکەری زۆر شـــارەزابوو ، بووبــەنائیبی مـــەلیك ، لــەکاتێکدا کــە لەشــکری میســر هاتــە ســەری زۆر بــاش توانــی خــۆی موادافەعەبکا و پاشەکشەی پێ بکا لە سالّی ٦٤٠ك دا لەشکری حەلــەب لەشکری خوارزەمی شکاند مانگێك دوای ئەمە زەعیفە خاتوون ، وەفـــاتی کرد ، دوای ئەمە مەلیك ناسر یوسـف جگــە لــە حەلــەب حوکمــی خــۆی بەسەر بەشی زۆری سوریەدا لە ئەلعەریشەوە تا فــورات حاکمیــەتی خــۆی جاری کرد ، لەتەرەف خەلیفەی بەغداوە عینوانــی ســولّتانی درایــە ، زۆر حەیف هۆلاکۆ ، سالّی ٦٥٨ك دا ، ڕووی کــردە حەلــەب ، ســولّتان ناســر یوسف مقاوەمەکی مەردانەی کرد و لەپاشــدا داوای یارمــەتی لــە میســر کرد ، بەلاّم میسر یارمەتی نەداو ناچار بوو حەلەبی بەجێ هێشــت و چــوە شام ، بەلاّم دیسان نــەجاتی نــەبوو کەوتــە دەس هۆلاکــۆ و لــەناوچوو ، وە حکومەتی حەلەبی ئەیوبی کورد بەجۆرە دوایی هات . لەدوای ٧٩ ساڵ .

## حوکومەتی ئەیوبی شام

٥٧٩ - ٦٥٨

سولّتان سەلاحەدین سوریەی دا بە مەلیك ئــەفزەلّی کــوڕە گــەورەی ، بەلاّم لەدوای وەفاتی سولّتان زۆری پــێ نــەچوو بــەینی مــەلیك ئــەفزەلّ و

مەلیك عەزیزی حوکمداری میسر تێك چوو ، لەدواییدا مەلیك عادلی مامی یشیان خۆی تێکەڵی ئەم هەرایە کرد و ماوەیەکی زۆر ئەم هەرایە درێژەی کێشاو چەند جارێك پایتەختی ئەم حوکومەتە کە شام بوو کەوتە ژێر موحاسەرەوە ، بەلاّم لەدوای وەفاتی مەلیك عەزیز و شکانی مەلیك ئەفزەڵ شام لەژێر ئیدارەی مەلیك عادل دا ، حەسایەوە لەدوای وەفاتی مەلیك عادل حکومەتی سوریە کەوتە دەس مەلیك عیسی کوڕی مەلیك عادل لەدوای وەفاتی مەلیك عیسا ، مەلیك ناسری کوڕی بوو بە مەلیکی سوریە ، بەلاّم مەلیك کامل وازی لێ نەهێناو بەلەشکرەوە چوە سەری مەلیك ئەشرەف موسی ی برای مەلیك کامل یەکەم جار لای مەلیك ناسری گرت ، بەلاّم لەدواییدا لەگەڵ مەلیك کامل رێك کەوت و شامیان گرت و ئیدارەی ئەم ولاّتە کەوتە دەس مەلیك ئەشرەف لە ساڵی ٦٢٦ك .

ئەوەندەی پێ نەچوو مەلیك ئەشرەف بۆ دەفعی هەرای جەلال الدین خوارزەمشا ، لەگەڵ سوڵتانی ڕۆم کەیقوباد دا ، ڕێك کەوت و لەشکرێکی لە قومانداری ئەمیر عز الدین عمری هەکاری نارد و ئەم دوو لەشکرە جەلال الدین یان لە نزیك ئەرزەنجان ، شکان لە ٦٢٧ك .

لەدوای ئەمە بەینی مەلیك ئەشرەف لەگەڵ مەلیك کاملی برایدا تێك چوو ، لەشکری میسر هاتە سەر شام و لەم کاتەدا مەلیك ئەشرەف وەفاتی کرد ، لەسەر دەمی مەلیك عادلی دوەمدا شەر و هەرای نێوان سەرکردەکانی ئەیوبی دەسی پێ کرد مەلیك صالح ئیسماعیلی حاکمی شام لە دژی مەلیك صالح ئەیوبی حاکمی میسر ، لەگەڵ فەرەنگدا ڕێك کەوت

، حاکمی میسر کە ئەم خەبەرەی بیست بەیارمەتی لەشکری خوارزەمیەکان ، هەردوو لەشکری مەلیك صالح ئیسماعیلی حاکمی شام و سەلیبیەکانی شکاند لە ساڵی ٦٣٤ك و سەر لەنویّ وڵاتی سوریە و میسری هێنایەوە ژێر دەس خۆی . لەدوای وەفاتی مەلیك تورانشای کوڕی مەلیك صالح ئەیوب ، حاکمی حەلەب مەلیك ناسر یوسف وڵاتی شامی گرت ، وە ئەم ئەمیرە دوایین مەلیکی ئەیوبی کورد بوو لە سوریە ، بەجۆرەی حکومەتی ئەیوبی کورد ٧٩ حەفتاو نۆ ساڵ دەوامی کرد لە سوریە .

## حکومەتی ئەیوبی حەمما

٦٩٨ - ٥٧٠

لەدوای ئەمە کە شاری حەما کەوتە دەس سوڵتان سەلاحەدین ، دای بە مەلیك موزەفەری کوڕی تقی الدین عمری برای ، وە نەتەوەی ئەم ئەمیرە لێرەدا حاکم بوون و دایمە چاویان لەوە بوو کە لەگەڵ حوکمدارە گەورەکانی ئەیوبی باش ڕابوێرن ، لەکاتی کە هۆلاکۆ ، هاتە سەر سوریە نەیان توانی بەرامبەری بوەستن و لەدوای شکان و گەڕانەوەی هۆلاکۆ لە سوریە بوو نە تابیعی حوکومەتی مەملوکی میسر ، برازای دوایین مەلیکی ئەیوبی کورد لە حەما ، مێژوو نووس و زانای مەشهور ئەمیر ئەبو الفداء ئیسماعیل بوو ، کەلەگەڵ سوڵتان محمد ناسردا بەشداری شەڕی کرد ، ئەو سوڵتانە زۆری خۆش ئەویست و شاری حەمای دایە و عینوانی سوڵتانیشی دایە ، لە ئیدارەی مەلیك ئەبو الفیداء دا ، شاری حەما زۆر تەرەقی کرد و

ئیستاش قەبری ئەم ئەمیرە گەورەیە لەوێیە ، لەدوای سوڵتان ئەبو الفیداء ، مەلیك ئەفزەڵ محەمدی کوڕی بەهۆی بێ ئیدارەیی خۆی ئەمنیەتی سوڵتانی میسری لەدەستدا و لە ئەنجامدا گیراو لەشام دا قەلاّ بەند کرا . بەم جۆرە حکومەتی ئەیوبی کورد لەشاری حەما لەساڵی ٦٩٨ك دوایی هات ، ئەم حکومەتە ١٢٨ سەدو بیست و هەشت ساڵ دەوامی کردوە .

## میرنشینی ئەیوبی حمص

٥٧٠ - ٦٦١

ولاّتی حمص لەساڵی ٥٧٠ی ك دا ، کەوتە دەس سوڵتان سەلاحەدین و لەدوای ئەم تاریخە بەچوار ساڵ ، دای بە محمدی کوڕی شێرکۆی مامی ، ماوەیەك ئەم ولاّتە لەتەرەف مەلیك ناسر یوسفی دووەمی حاکمی حەلەبەوە زەوت کرا لە ساڵی ٦٤٦ك دا ، بەلاّم ئەوەندەی بەدەسیەوە نەما ، جگە لەم ماوە کورتە ، دایمە بەدەس نەتەوەی شێرکۆ وە بوو ، حکومەتی ئەم خانەدانە تا ساڵی ٦٦١ك دەوامی کرد ، وە لە هاتنی هۆلاکۆدا ، بێ مقاوەمە قاپی شاری حمص یان بۆ کردەوە و بەمجۆرە حکومەتی خانەدانی شێرکۆی ئەیوبی کورد دوایی هات لە حمص ، ئەم میر نشینە ٩١ ساڵی دەوام کرد .

# میر نشینی ئەیوبی یەمەن

٥٦٩ - ٦٢٥

وڵاتی یەمەن لەتەرەف مەلیك تورانشای برای سوڵتان سەلاحەدین ەوە گیرا ، تورانشا ماوەی دووساڵ بەناوی کاکیەوە بوو بە حاکمی یەمەن ، لەپاشدا وەکیلێکی بەسەرەوە دانا و خۆی گەڕایەوە میسر ، لەدوای وەفاتی تورانشا ، یەمەن درا بە مەلیك تەغتەکین ی برای سوڵتان سەلاحەدین لە ساڵی ٥٧٩ك تا ساڵی ٥٩٣ك وەفاتی کرد ، لەدوای ئەم مەلیك مەعز ئیسماعیلی کوڕی هاتە جێگەی ، بەڵام لە ٥٩٨ك دا کوژرا . لەدوای ئەم ناسر ئەیوبی برای جێگەی گرتەوە و ئەویش لە ساڵی ٦١١ك دا دەرمان خوارد کرا ، لەدوای ئەم مەلیك مەسعود سەلاحەدین یوسفی کوڕی مەلیك کامل بۆتە حاکمی یەمەن و بەقوەتێکەوە ڕووی کردە یەمەن و لە ٢ی محەرەمی ٦١٢ك دا ، گەیشتە پایتەختی یەمەن کە ئەوکاتە شاری زبید ، بوو ، لەدوای گرتنی تعز سلیمان بن تقی الدین عمر بن شهنشاه ، لەگەڵ ئیمامدا کەوتە شەڕەوە و لە ٨ی جماد الاخر ٦١٤ك دا ، شاری صنعای گرت ، لە ٦١٩ك دا وڵاتی یەمەنی دابە کورانی ڕەسولی کورد ، بەخۆی گەڕایەوە میسر ، لەساڵی ٦٢٤ك دا ، هاتەوە یەمەن و کورانی رسولی کوردی حەپس کرد و لە عەینی ڕۆژدا بەری دان ، وە لە هەمان ساڵدا گەڕایەوە میسر و ئیدارەی وڵاتی یەمەنی دیسان دایەوە دەس نور الدین عمری کوڕی علی رسولی کورد ، پاش ماوەیەك ئەمیر نور الدین سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند و حکومەتی رسولی یەمەنی دامەزراند بەجۆرە

حکومەتی ئەیوبی کورد لە دوای ٥٦ ساڵ لە وڵاتی یەمەن دوایی هات و بەڵام حکومەتی رسولی کورد لە یەمەن تا سەدەی نۆی کۆچی بەردەوام بوو .

## میرنشینی ئەیوبی جزیرە

### ٥٨١ - ١٠٠٠

شاری میافارقین لە ناوچەی جزیرە ، لە ساڵی ٥٨١ك دا ، کەوتە بەر دەستی سوڵتان سەلاحەدین ، میر نشینی جزیرەی ئەیوبی کورد لە ساڵی ٥٨١ی ك دامەزراوە و تا ساڵی ٦٤٣ك بەردەوام بوو ، بەڵام لەم مێژوەدا و لەسەردەمی مەلیك موزەفەر غازی دا بەدەس مەغۆلەکان لەناو چوو ، پایتەختی ئەم میرنشینە شاری میافارقین بوو ، بەڵام لە هەندێك شارانی جزیرە و کوردستاندا ، بەقایای ئەیوبی کورد هەرما بوو ، لەوانە میر نشینی ئەیوبی حصن کیف لە جزیرەی کوردستان تا ساڵی ١٠٠٠ هەزاری کۆچی بەردەوام بوو پایتەختی ئەم میرنشینە شاری حصن کیف بوو ، واتە میر نشینی ئەیوبی کورد لەشاری حصن کیف لەساڵی ٥٨١ی کۆچیەوە تا ساڵی ١٠٠٠ هەزاری کۆچی بەردەوام بوو ، لەدوای نزیکەی چوارسەد ساڵ عوسمانیەکان روخاندیان ، بەجۆرە حوکمی خانەدانی ئەیوبی کورد لەناوچەی جزیرە دوایی هات .

## ژمارەی مەلیکەکانی ئەیوبی کورد

ژمارەی ١٦٧ مەلیکی بنەماڵەی ئەیوبی کورد ، لە وڵاتانی سودان ، میسر ، لیبیا ، حەزرەمۆت ، یەمەن ، حیجاز ، ئەردەن ،

فەلەستین ، لوبنان ، سوریا ، کوردستانی سوریا ، کوردستانی تورکیا ، کوردستانی عێراق ، کوردستانی ئەرمینیا ، نزیکەی سەد ساڵ لە هەندەك ولآت و هەندەك شوێن چوار سەد ساڵ لە هەندێك شوێنی تر حوکمیان بەردەوام بوو ، بۆ ئەم راستی‌یە بڕوانە کتێبی شفاء القلوب في مناقب بني ايوب لە نووسینی احمد بن ابراهیم الحنبلی ، وە مظفر الدین کوکبری ناسراوە بە سوڵتان موزەفەری هەولێر ، زاوای سوڵتان صلاح الدینی ئەیوبی کە رابیعە خاتوون کچی نجم الدین ئەیوبی خێزانی بووە ، یەکێك بووە لەمەلیکەکانی ئەیوبی کورد.

والی سودان – ابراهیم الکوردی بۆ ئەم راستی‌یە بڕوانە کتێبی الروضتین ـ ج١- ص٢٠٩ والی ئەرمینیا تقی الدین برازای سوڵتان صلاح الدین بوو ئەوە لە مێژووی ئەیوبیان دیارەو پێویست بەسەرچاوە ناکات ، والی بیروت لبنان ، سامە الکوردی بوو ، بروانە ابن شداد –ص ١٦٣ کە ئێستا گۆڕەکەی لە نزیك دوین کە شوێنی ئەصلی بنەماڵەی ئەیوبیە ، کە ئێستا گۆڕی ناوبراو بەمەزاری صۆفی سام مەشهورە

## قازی و زاناکانی دەوڵەتی ئەیوبی

ئەمە ناو و شوێنی هەندێك لە زاناکانی دیار و ناسراو بوون لەسەر دەمی دەوڵەتی ئەیوبی کورد .

١. قازی حەما ضیاء الدین ئەبو الفضائل کوری یحیی کوڕی عبدالله شارەزوری .

٢. قازی المعره موفق الدین ابو القاسم الحمیدی خەڵکی ئاکره .

٣. قازی حەلەب کمال الدین شارەزووری لەسەردەمی نورالدین زەنگی .

٤. قازی سمساك الزرزاری – زراری بوو .

٥. قازی قوزاتی شام ابن خلکان ، خەلەکان – خەلان .

٦. قازی قوزاتی میصر بدرالدین السنجاری .

٧. مجدالدین ناسراو بە ابن أثیر ، کوڕی ئەبو الکرم خەڵکی جزیرەیەو کورد بوو ، وەزیری مەلیك ئەفزەڵی کوڕی سوڵتان صلاح الدین بوو .

٨. زانای بەناوبانگ عوسمان کوڕی عبدالرحمن – ناسراو بە ابن صلاح شارەزووری ، مامۆستای دار الحدیس بوو لەسەردەمی مەلیك ئەشرەفی ئەیوبی کورد .

٩. عیزەالدین عبدالسلام – ناسراو بە سوڵتان العلماء لە کوردەکانی شام بوو قازیو خەتیبی شام بوو.

١٠. ابن حاجیب قازیو زانای بەناوبانگی خەڵکی زاخۆ بوو باوکی پەردە داری میر عزالدین صلاحی کورد بوو ، بۆیە لەقەبی ابن حاجیبی بەسەردا بڕاوە .

١١. عوسمان کوڕی ئەبوبەکر کوری یونس الکوردی خەڵکی شارەزوور یەکێك بوو لە زانا بەناوبانگەکانی کورد ، مامۆستای مەدرەسەی الفاضلیة بوو لە قاهیرە ئەو مامۆستایە ناسراوە بە شێخ جمال الدین أبو عمر الکوردی هەروەها لە مەلا بەناوبانگەکانی کورد وەکوئەندامی مەجلیسی شوورا و قازی و کاتب لای سوڵتان صلاح الدینی ئەیوبی کورد .

١٢. عیسی الهکاری .

١٣. عیمادالدین

١٤. ابو المشتوب الهکاری

١٥. القمری

١٦. الدیار بکری .

١٧. والاربیللی .

١٨. قازی ابن شداد .

وە هەروەها ئەو ژنە ئەیوبیانەی کە ڕۆڵی گرنگیان بینیوە و ناویان لە میژوو تۆمار کراوە ، وەك [٤] زەعیفە خاتوون ، کچی مەلیك عادلی ئەیوبی کە بووبە جێگری مەلیك ناصر یوسفی

---

[٤] - تاریخی کورد و کوردستان ، ل ١٣٥

دووەم و مەلیك هێشتا منالْ بوو ، زەعیفە خاتوون ، هەرخۆی ئیدارەی دەوڵەتی ئەیوبی حەلەبی گیراوە و ، زۆر زیانێکی گەورەشی لە دوژمن داوە هەروەها زمرەدە خاتوون و ، ربیعە خاتوون و ، دایکی ئیبن لاچین ، کەرۆڵی گرنگیان بینی لە دروست کردنی مزگەوت و قوتابخانەو خەستەخانەو تەکیە و خانەقاو ، کاری خێر خوازی کە مێژوو بە شنازییەوە باسیان دەکا .

## هۆی روخانی دەوڵەتی ئەیوبی

دەوڵەتی ئەیوبی کورد کە لەسەر میراتی خەلیفەکانی فاتیمی‌میسرو مەلیکەکانی زەنگی کورد ، دامەزرابوو بەرەغمی هجومی یەك لە دوای یەکی سەلیبیەکان ، لە دەوری سولتان صلاح الدین و مەلیك عادل و مەلیك کامل دا ، شەوکەتێکی تەواوی هەبوو .

هۆی روخانی ئەم دەوڵەتە گەورەیە ، یەکەم شەڕو ململانێی سەرکردەکانی ئەیوبی بوو خۆ بەخۆ لەسەر تەماح و کورسی ، دووەم هێرشە یەك لە دوای یەکی سەلیبیەکان، سێهەم کۆیلەکانی میسر ، چوارەم لەشکری تەتەرو هۆلاکۆی مەغۆلی داگیر کەر بەلام ئەتوانین بڵێین هۆی سەرەکی روخانی دەوڵەتی ئەیوبی تەنیا و تەنیا شەڕو ململانێی سەرانی ئەیوبی بوو خۆ بەخۆ . چونکە لەسەردەمی سولتان صلاح الدینی قارەمان دا ، لەشکری سێ دەوڵەتی زلهێز

ئەڵمانیاو بریتانیاو فەرەنسا ، جگە لە لە دەوڵەتی قودس و هی تریش هەر هەموویان پێکەوە پەلاماری لەشکری سوڵتان صلاح الدینی کوردیان داو ئەم شەڕە ماوەی دوو ساڵ بەردەوام بوو ، زیاتر لە ٢٥٠ هەزار سەلیبی کوژرا ، لەگەڵ ئەمەشدا ، جگە لە پارچەیەکی باریك لە صور تا عەککا ، نەیانتوانی فەلەستین بگرن ، کەوا بوو ئەگەر کورو نەوەکانیشی لەسەر هەمان ڕێباز کاریان بکردبایە و شەڕو ململانێی خۆ بەخۆیان نەکردبایەو ، ئەو دەوڵەتە گەورەو ، بەهێزەیان پچڕ پچڕ نەکردبایە ، ئەوە بەهێزی هۆلاکۆش نەدەڕوخا ، بەلاّم نەك هەر ئەم دەوڵەتە بگرە هەر لە دەوڵەتە گەورەکەی میدیای کوردەوە تا هەر هەموو حوکومەت و میر نشینە کوردیەکان ئەگەر بەهێزی دوژمنیش ڕوخابن ، بەلاّم هۆی سەرەکی تەنیا کورد خۆی بووە ، کەوا بوو زۆر پێویستە پەند لە ڕابردوو وەربگرین و ، وەك برا بژین ، بۆ ئەوەی کە بتوانین وەکو گەلانی تری جیهان بە ئازادی بژین .



## ژیان نامەی نووسەر

ناوی نووســەر خـالید حسـین مـام وسـو ، ناسراو بە ( مەلا خالید فریـزی ) لـە سـالّی ١٩٥١ لـە گونـدی (فریـز) سـەربە ناحیـەی (هیران) لەدایك بـووە و هـەر لـە گوندەکـەی خۆی ( قورئانی پیرۆز و ژمارەیەك کتێبی ئاینی خوێندوە و ، پاشان بۆ خوێندن چوەتە شەقلاّوە لە خزمەت مامۆستا مەلا حسین فریـزی لـە مزگەوتی حاجی سـەلیم کتێبـی ( گولّسـتان و بۆسـتانی ) فارسـی خوێندوە و پاشان لە مزگەوتی گەورە لە شـەقلاّوە ژمـارەیك کتێبـی ( نحو و صرفی )ی لەخزمەت مامۆستا ( مەلا صادق و مەلا هـادی) خوێندوە و ، دوای ئەمە چویتە مزگەوتی ( عثمان میران) لـە خزمـەت مامۆسـتای گـەورە و ناسـراو بـە ( مـەلا مجیـد ) گـراوی کتێبـی ( شرح العقائد)ی خوێندوە ، پاشان لە سالّی ١٩٦٧ دا چویتە شارۆچکەی مەسیف صلاح الدیـن لـە خزمـەت مامۆسـتا مـەلا عمـر سـەعید لـە مزگەوتی گەورە لەگەلّ مـەلا ئەحمـەد حـاجی روسـتای مـاوەی (٣) سـالّ ماوەتەوە و کتێبی (جمع الجوامع و تهذیب و تشریح الأفلاك )ی خوێنـدوە و هەرلـە خزمـەت مامۆسـتا مـەلا عمـر سـعید لـە سـالّی (١٩٧٠)دا (بڕوانامەی زانستی ئاینی) وەرگرتووە .

پاشان بووە بە ئیمام و خەتیب لە مزگەوتی گوندی (فریز) وە لە هەمان ساڵدا بە بڕیاری شۆرش بووە بە مامۆستای قوتابخانە ، پاشان هەر لە هەمان ساڵدابەشدار بووە لەیەکەم کۆنگرەی یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلام کەلە ١٩٧٠/٩/٢١ لە شارۆچکەی (گەلاڵە ) بەسترا ، پاشان لە ساڵی ١٩٧٤دا ، چووە بۆ ئێران لە ئۆردگای (زیوە) بووە بە مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی و پاشان لە ئۆردوگای (سەرئابلە) نزیك (کرماشان) پاشان لە ساڵی ١٩٧٥ گەڕایەوە بۆ کوردستان ، پاشان لە ساڵی ١٩٧٧ تەعین کرا بە ئیمام و خەتیب لە مزگەوتی گوندی فریز پاشان لە ساڵی ١٩٨٠ چووە گوندی (دۆرە) نزیك هیران ، تا ساڵی ١٩٨٨ ڕژێمی بەعس خانوەکەی ڕوخاندو ، ماڵەکەی بەزۆر بارکرد بۆ ئۆردووگای باسرمە لە نزیك ناحیەی هەریر ، پاشان لە ئۆردووگای باسرمە بەردەوام بووە لە خزمەتی ئایین و گەل و نیشتمان ، لەم ڕووەوە لە ساڵی ١٩٩٤دا ، کاتی شەڕی ناوەخۆ سەری هەڵداو دروست بوو لە نێوان پارتی و یەکێتی ، مەلا خالید بە حوکمی مەلایەتی وەك کوردێکی دڵسۆز هەر زوو بەرایی لەشەڕەکە گرت و کۆمەڵێك ڕیش سپیی و پیاوانی ئاینی کۆکردەوە و ، لەگەڵ بەرپرس و کادیرانی هەردوو حیزب کۆبوونەوە و ، هەردوولا بڕیاریاندا شەڕ لە کۆمەڵگای باسرمە نەکرێ و تفاقنامەی ئاشتی و برایەتی و پێکەوە ژیانیان ئیمزا کرد ، هەرچەندە ئەم شەڕە برا کوژ و نەگریسە سەرانسەری کوردستانی ئازادکراوی گرتەوە ، بەلآم شوکر بۆخوا ،

ئۆردووگای باسرمە لەم شەڕە زیانبەخشە ڕزگار بوو وە ئێستاش پەیوەندی برایەتی و پێکەوە ژیان لەم کۆمەڵگایەدا ، لەزیاد بووندایە .
وەئێستاش نووسەر ئیمام و خەتیبە لە مزگەوتی (ناوسیم) لە ئۆردووگای باسرمە ، وە بەردەوامە لە خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام و گەل و نیشتمان .

میژوو پاسەوانی گەل و خاکیەتی — هەردەم لە خزمەت نەوەکانیەتی
میژوو وەك شاخە بە دوژمن ناشکێ — چەکێکی قورسە و بەرگری ناکرێ
وەکو ئەستێرە ئەدرەوشێتەوە — دوژمن نایگاتێ بیکوژێنێتەوە
میژوو وەك دەریا پێشی ناگیرێ — دوژمن لەداخا ئەبێ بگریێ
گەل بەبێ میژوو وەك نەبێ وایە — گەلان نازانن ئەو گەلە کێیە

فریزی

## لە بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر

١ - میر نشینی سۆران .
٢-دەوڵەتی ئەیوبی کورد .
٣-جیهان چۆن دروست کراوە .
٤ - پوختەیەك لە میژووی کورد .

## سەرچاوەکان

١- تاريخ صلاح الدين الايوبي ، تاليف دكتور باز .

٢- شفاء القلوب في مناقب بني ايوب ، تأليف احمد ابن ابراهيم الحنبلي .

٣- تاريخ الكرد وكوردستان - محمد امين زكي .

٤- شەرەفنامە - شەرەفخانی بدلیسی .

# سەرباسەکانی ئەم نامیلکەیە


| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| ١- پێشەکی . | ٣ |
| ٢- باسی بنەچەکەی بنەماڵەی ئەیوبی . | ٤ |
| ٣- سەلاحەدین چۆن پێگەیشت . | ٧ |
| ٤- یەکەم سەفەری بۆ میسر . | ٨ |
| ٥- دووەم سەفەری بۆ میسر . | ٩ |
| ٦- سێیەم سەفەری بۆ میسر . | ١١ |
| ٧- وەزارەتی ئەمیر سەلاحەدین . | ١٢ |
| ٨- مەلیک سەلاحەدین . | ١٥ |
| ٩- سوڵتان سەلاحەدین . | ١٨ |
| ١٠- سوڵتان سەلاحەدین و خاچ پەرستەکان . | ٢٧ |
| ١١- وەفاتی سوڵتان سەلاحەدین . | ٤١ |
| ١٢- کورانی سوڵتان سەلاحەدین . | ٤٦ |
| ١٣- دەوری سەڵتەنەتی مەلیک عادل . | ٤٨ |
| ١٤- دەوری سەڵتەنەتی مەلیک کامل . | ٥٠ |
| ١٥- مەلیک عادلی دووەم . | ٥٣ |
| ١٦- مەلیک صالح نجم الدین ئەیوب . | ٥٥ |
| ١٧- دەوری سەڵتەنەتی مەلیک تورانشا . | ٥٧ |

١٨- دوایی حوکومەتی ئەیوبی میسر . ٥٩
١٩- حکومەتی ئەیوبی حەلەب . ٦٠
٢٠- حکومەتی ئەیوبی شام . ٦١
٢١- حکومەتی ئەیوبی حەما . ٦٣
٢٢- میر نشینی ئەیوبی حمس . ٦٤
٢٣- میر نشینی ئەیوبی یەمەن . ٦٥
٢٤- میر نشینی ئەیوبی جزیرە . ٦٦
٢٥- ژمارەی مەلیکەکانی ئەیوبی . ٦٦
٢٦- قازی و زاناکانی دەوڵەتی ئەیوبی . ٦٨
٢٧- هۆی ڕوخانی دەوڵەتی ئەیوبی . ٧٠
٢٨- ژیاننامەی نووسەر . ٧٢
٢٩- سەرچاوەکان . ٧٥
٣٠- سەرەباسەکانی ئەم نامیلکەیە . ٧٦



مێژوو پاسەوانی گەل و خاکیەتی — هەردەم لە خزمەت نەوەکانیەتی

مێژوو وەك شاخە بە دوژمن ناشکێ — چەکێکی قورسە و بەرگری ناکرێ

وەکو ئەستێرە ئەدرەوشێتەوە — دوژمن نایگاتێ بیکوژێنێتەوە

مێژوو وەك دەریا پێشی ناگیرێ — دوژمن لەداخا ئەبێ بگریێ

گەل بەبێ مێژوو وەك نەبێ وایە — گەلان نازانن ئەو گەلە کێیە

فریزی